ناوی کتێب: ئیماناسی - عەقیدەی ئیسلامی

نووســینی: صــلاح الدیـن أحـــمد

دیزاینی ناوەوە: زەردەشـت کاوانی

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠٢٣

تیـــراژ: (١٠٠٠) دانـــە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (   )ـی ساڵی (٢٠٢٣)ـی پێ دراوە.

# پێشەکی

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ئیسلام وەك دوایین پەیامی خودایی بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی هاتووە بە مەبەستی ڕاستەڕێکردن و هیدایەتدان و فێرکردن و تەزکیە و پاکردنەوەی مرۆڤ، بۆ هێشتنەوەی لەسەر فیترەت و بنەچە پاکەکەی، بۆ بیرکردنەوەی درووست و ناخپاکی و کردەوەجوانی و گوفتار و ڕەفتار بەرزی، بۆ هزرین و عەقڵکاری، بۆ زانست و بەدواداچوون، بۆ ئەخلاقی بوون و گەیشتن بە بەها بەرز و باڵاکان، بۆ ئاشتەوایی کۆمەڵایەتی و جیهانی، بۆ ئارامی دڵ و دەروون، بۆ ڕاگرتنی ستەمکار و زاڵمان، بۆ عەدل و ئیحسان، بۆ میانڕەویی و وەسەتیەت، بۆ واقیعی بوون و ئامانجداری، بۆ هیوا و ئومێد، بۆ پێشکەوتن و گەشەسەندن، بۆ خوداپەرستی حەقیقی، بۆ پێکەوەژیان و لابردنی چینایەتی، بۆ دوورکەوتنەوە لە هەموو پیسی و نائەخلاقی و ناشیرینییێك، بۆ دووربوون لە هەموو زیانبەخش و وێرانکارییێك، بۆ...

کۆڵەکە و بناغەی ئیسلام و موسڵمان فکرە، بناغە و کۆڵەکەی فکری کەسی موسڵمانیش بریتییە لە بیروباوەڕ و عەقیدەی ئیسلامی، لەم سۆنگەیەوە هەستاین بە نووسینی ئەم کتێبە.

## مەنهەجمان لە نووسینی ئەم پەرتووکە :

**١.** کورتی و پوختی و درێژدانەدڕی، ئەوەش بۆ گەورە نەبوونی ئەنـدازەی کتێبەکە و لاپەڕەکانی و ئـاسـان بـڵاوبوونەوە و خوێندنەوەی، ئەگەرنا کتێبەکە خۆی درێژ بوو، بەڵام ئێمە کورتمان کردەوە لەبەر ئەم مەبەستانە.

**٢.** ڕوونی و سادەیی و بێ گرێوگۆڵی، بۆئەوەی بگات بەدەستی زۆرترین کەس و زۆرترین کەس سوودی لێ ببینن.

## چـەند تێبینییەك:

**١.** ئەم کتێبە کاکڵە و کرۆکی عەقیدەی ئیسلامی خستۆتەڕوو، واتە تەنها هێڵە گشتییەکان، تەنها کۆدەنگی لەسەرەکان (المتفق علیها)، نەچووەتە ناو هەندێ بابەتی جوزئی و ئیختلافی و ڕاجیایی لەسەر.

**٢.** ئەم کتێبە لەسەر هیچ ڕێباز و مەزهەب و ڕەوت و تەوژمێکی دیاریکراو نەنووسراوە، چونکە وەك باسمانکرد تەنها کۆدەنگی لەسەرەکانمان خستۆتەڕوو - (کۆدەنگی لەسەرەکانیش هەموو ڕێباز و مەزهەب و ڕەوت و تەوژمەکان تێیدا کۆدەنگن) - ڕاجیایی لەسەرەکانمان باس نەکردووە، چونکە پێمانوایە تەنها بابەتە قەتعی و کۆدەنگی لەسەرەکان دەبنە عەقیدە، ئەوەی دیکە دەچێتە بازنەی فیقهی عەقیدە، فیقهی عەقیدەش _ (هەموو ئەو شتانەی ڕاجیاییان لەسەرە و بۆچوونی جیاجیا هەڵدەگرن) -

ناکرێ خەڵکی لەسەر دادگایی بکرێت، یان گومڕاکردن و تەبدیع و تەفسیقی لەسەر بنیات بنرێت.

٣. ئەم کتێبە بەشێوازێك نووسراوە بتوانرێت بکرێتە پڕۆگرام و مەنهەجی خوێندن و خوێندنەوە و دەرس.

٤. لە ساڵی ٢٠١٩ کتێبی (البيان في أركان الإيمان)ی (شيخ مجد مكي)م کورتکردەوە بەناوی (لب العقيدة الإسلامية في ضوء الوحي والعقل)، سوپاس بۆ خوای گەورە زۆر سوودبەخش بوو و بوو بە مەنهەجی خوێندن لە زۆرێك لە حوجرە و مەدرەسە و پەیمانگاکان، دواتریش (م. هونەر کەمال) وەریگێڕایە سەر زمانی شیرینی کوردی، منیش لەم کتێبەدا لە هەندێ شوێندا سوودم لێ بینیوە.

لەکۆتاییدا ئەمە کارێکی سادەیە لە بەندەیەکی سادەوە، بە زانستێکی سنووردارەوە، داواکارم لە خودای گەورە سوودبەخش بێت بۆ هەموو لایەك و لە کەمووکوڕی و کەمتەرخەمی و نەپێکانی منیش ببورێت.

صــلاح الــدين أحـــمد

ڕانیە

٢٥ / ١٢/ ٢٠٢٢

## پێناسەی بیروباوەڕ (عەقیدەی)ی ئیسلامی لە ڕووی زمانەوانی

بیروباوەڕی ئیسلامی لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێت: «عەقیدەی ئیسلامی» «العقيدة الإسلامية»، کە لە ڕووی زمانەوانییەوە لە (عقد) وەرگیراوە بەواتای: بەستن و گرێدان و توندوتۆڵی و پتەوی دێت، بۆنموونە کە دەوترێت: (عَقَدَ الرَّجُلُ الحَبْلَ والبَيْعَ والعَهْدَ). واتە: پیاوەکە گوریسەکەی گرێدا، کڕین و فرۆشتنی گرێدا یاخود پەیمانی بەست.

هەروەها بریتییە لەوەی کە مرۆڤ دڵی پێوە گرێدەدات، پاشان وەرگیراوە و بەکارهێنراوە بۆ ئەو بیروباوەڕ و بۆچوونانەی مرۆڤ دیندارییان پێوە دەکات و باوەڕی پێیان هەیە و لە دڵ و سینەدا جێگیر دەبێت و لە هەڵسوکەوت و ڕەوشتدا ڕەنگدەداتەوە.

### پێناسەی بیروباوەڕ (عەقیدەی)ی ئیسلامی لەڕووی زاراوەوە

عەقیدە لەڕووی زاراوەوە (لای زانایانی ئەم بوارە) بریتییە لەو زانستەی کە بەهۆیەوە دەتوانرێت بیروباوەڕەکانی دین (ئیسلام) بچەسپێنرێت، بە هێنانی بەڵگەکان و ڕەواندنەوەی گومانەکان[1].

---

(١) المواقف للإيجي، ب ١، ل ٣٥.

بەم پێیە زانستی عەقیدە دوو ئەرك و وەزیفەی سەرەكی هەیە:

١. جێگیر كردن و سەلماندنی بیروباوەڕ و عەقیدە ئیسلامی بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی.

٢. ڕەواندنەوەی هەموو ئەو گومانانەی لەسەر ئەم بیروباوەڕ و فكرەیە پەیدا دەبن.

## بابەتە سەرەكیەكانی بیروباوەڕ:

بابەتە سەرەكیەكانی بیروباوەڕ بریتین لە:

باسی خودا (الإلهیات) ئەو بابەتانەی پەیوەندی بە خواوە هەیە.

باسی پێغەمبەران (النبوات) ئەو بابەتانەی پەیوەندی بە پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەران و كتێبە ئاسمانییەكانەوە هەیە.

باسی شتە بیستراوەكان (السمعیات): ئەو بابەتانەی كە لە ڕێی نەقڵ و وەحییەوە پێمانگەیشتوون وەك: هەبوونی فریشتەكان و جنۆكەكان و بەهەشت ودۆزەخ ...

یان دەتوانین بەشێوەیەكی دیكەش دابەشی بكەین:

١- خودای گەورە

٢- فریشتەكان

٣- پەرتووكەكانی خودای گەورە

٤- پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەران

٥- ڕۆژی دوایی

٦- قەزا و قەدەر (خێر و شەڕی).

## بەڵگە و سەرچاوەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی

**بەڵگە و سەرچاوەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی بریتین لە: بەڵگە نەقڵییەکان (قورئان و سوننە) لەگەڵ بەڵگە عەقڵییەکان[1].**

### ناوەکانی زانستی عەقیدە :

**١. فیقهی مەزن و گەورە (الفقه الأكبر): ئەم ناوە یەکەمجار ئیمامی ئەبو حەنیفە بەکاری هێناوە، ئێمە دوو جۆر فیقهمان هەیە: فیقهی مەزن و گەورە کە عەقیدە و بیروباوەڕە، فیقهی بچووك**

---

(١) فکری ئیسلامی بۆ دەستخستنی زانیاری تەنها پشت بە سەرچاوەیەك نابەستێك وەك فەلسەفەکانی تر، چونکە فەلسەفەکانی تر هەریەکان پشت بە سەرچاوەیەك یان چەند دانەیەك دەبەستێت، ڕێبازی وا هەیە تەنها پشت بە عەقڵ دەبەستێت، هەشە تەنها پشت بە هەستەکان و ماددە و ئەزموون دەبەستێت، هەشیانە تەنها پشت بە دڵ و هەستە ناوەکییەکان دەبەستێت، هەندێکیشیان تەنها پشت بە ئیلهام و حەدس دەبەستن!
بەڵام سەرچاوەکان و ڕێگاکانی بەدەستهێنانی زانیاری و مەعریفە لای موسڵمانان زۆر فراوانە و فکری ئیسلامی پشت بەمانە دەبەستێت:
١. وەحی، نیگا، پەیامی خودا، هەواڵی یەقین و ڕاست
٢. پێنج هەستەکان، ئەزموون، ماددە، گەردوون و کەون
٣. عەقڵ و هۆش و بیکردنەوە
کەواتە ئیسلام تیۆریای مەعریفەی زۆر فراوانە و سەرچاوەکان لەچەند سەرچاوەیەکی دیاریکراودا کورت هەڵناهێنێت.

کە ئەحکامی فیقهی و فەرعییە، کەواتە فیقە و تێگەیشتن لە بیروباوەڕ و عەقیدە ئەسڵ و بنچینەیە، وە فیقە و تێگەیشتن لە ئەحکامی فیقهی فەرعە.

**٢.** زانستی بیروباوەڕی ئیسلامی (علم العقیدة الإسلامیة).

**٣.** زانستی بنەماکانی ئایین (أصول الدین): بۆیە وای پێدەوترێت، چونکە هەڵدەستێت بە ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی بنەماکانی بیروباوەڕ و عەقیدە.

**٤.** زانستی یەکخواناسی و یەکخواپەرستی (التوحید): بۆیە بەم ناوە ناودەبرێت، چونکە یەکخواناسی و یەکتاپەرستی ناودارترین و گرینگترین بابەت و بەشی ئەم زانستەیە.

**٥.** ئیمان، (الإیمان)، لەبەر ئەو فەرموودەیەی جبریل (علیه السلام)، کە دێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێدەکات دەربارەی (ئیسلام و ئیمان ئیحسان).

**٦.** زانستی کەلام، (علم الکلام) هۆکاری ئەم ناونانەش دەگەڕێتەوە بۆ:

**١.** زانایانی کەلام (موتەکەللیمەکان) قسەیان دەربارەی شتانێك کردووە و لە شتانێکدا دواون کە پێشینانیان لەم شتانەدا قسەیان نەکردووە و نەدواون لێیان، بۆنموونە باسی خەلقی قورئان و ناو و سیفەتەکانی خوای گەورە و قەزا و قەدەر و... .




**٢.** گرینگترین و باوترین بابەت کە جیاڕایی لێکەوتۆتەوە بابەتی (فەرمایشت و قسەی خودا) (کلام الله)، (بەدیهێنراوی قورئان) (خلق القران) بووە، هەر بۆیە ئەم زانستە بەم بابەتە مشتومڕ و جیاڕا لەسەر ناونرا.

**٣.** توانای قسەکردن و گفتوگۆ دەبەخشێت لەبارەی چەسپاندنی بابەتە عەقیدەیی و فکرییەکان و گفتوگۆکردن لەگەڵ دژەکاندا.

**٤.** چونکە بابەتەکانی ئەم زانستە بە (الکلام فی کذا وکذا) واتە: (دوان لە فڵان بابەت و فڵان بابەت) دەست پێدەکات.

**٥.** چونکە ئەم زانستە بە قسەکردن و دوان و گفتوگۆ لە نێوان لایەنە جیاوازەکاندا دێتەکایەوە.

**٦.** چونکە لە هەموو زانستەکانی تر زیاتر جیاوازی و ڕاجیایی و کێشمەکێش هەڵدەگرێت، ئەمەش پێویستی بە قسەکردن و گفتوگۆکردنە لەبارەیانەوە.

**٧.** بنەما و ئەساسەکەی بریتییە لە کەلام و قسەکردن و هیچ جۆرە کار و کردەوەیەکی تێدا نییە.

## مێژووی زاراوەی عەقیدە (العقیدة)

لە چوار سەدەی سەرەتای ئیسلامدا زاراوەی (العقیدة) بەکارنەهاتووە، هەتا ئیمامی صابوونی (أبو عثمان إسماعیل الصابونی) هات، ئیمامی صابوونی لە ساڵی (٤٤٩)دا وەفاتی

کردووە، یەکەم کەس بوو لە کتێبەکەیدا بەناوی (عقيدة السلف وأصحاب الحديث) زاراوەی عەقیدەی بەکارهێنا، دواتر ئەم زاراوەیە بڵاوبۆوە و زۆرێك لە زانایان بەکاریانهێنا هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت.

## ئامانج و گرنگی بیروباوەڕی ئیسلامی

١- ئازادکردن و ڕزگارکردنی عەقڵ لە لاساییکردنەوەی کوێرانە و گومانی بێبنەما و گەیاندنی بۆ لوتکەی باوەڕ.

٢- ئازادکرنی مرۆڤ لە پەرستنی غەیری خوای پەروەردگار.

٣- پاراستنی بنچینە و یاساکانی ئیسلام لە گومانی بێباوەڕان.

٤- ڕێنمونی کردنی ئەو کەسانەی کە بەدوای ڕێنمونیدادەگەڕێن بە ڕونکردنەوەی ڕێگای ڕاست بۆیان و پابەندکردنی نکۆڵیکاران بە هێنانی بەڵگە لەسەر بیروباوەڕ و گومانەکانیان.

٥- بنیاتنانی زانستە شەرعییەکان لەسەر ئەم زانستە، چونکە ئەم زانستە بنچینەی هەموو زانستەکانە.

٦- ڕێکخستن و پاکردنەوەی ڕەفتار و ڕەوشت.

٧- پەروەردەکردنی دڵ بۆ مانەوەی بەزیندوویی.

## حوکمی بیروباوەڕی ئیسلامی لە ڕووی شەرعییەوە

١- واجبی (عینی) فەڕز لەسەر هەموو کەس.

٢- واجبی (کیفائی) فەڕز لەسەر هەندێك.

واجبی خودی (عینی): بریتییە لە زانینی بابەت و بەڵگەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی، ئەوەش لەسەر هەموو موسڵمانێکی ژن و پیاو پێویستە.

واجبی ناخودی (کیفائی): بریتییە لە زانینی بابەت و بەڵگەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی بەوردی و تێروتەسەلی، ئەمەیان لەسەر هەموو کەس واجب نییە، تەنها لەسەر خەڵکێکی تایبەت واجب و پێویستە.

## حاجەت و پێویستی بۆ عەقیدە و بیروباوەڕ

مرۆڤ بە هەموو بوونیەوە پێویستی بە بیروباوەڕ و عەقیدە هەیە، چونکە مرۆڤ کە باوەڕی بە خودا و ڕۆژی دوایی و چاودێری خودایی و.... هەبوو، ئەوە بەدڵناییەوە بەهێزترین پاڵنەرە بۆ کردنی کارە باشەکان و نەکردنی کارە خراپەکان، بۆنموونە کەسێك پارەیەکی زۆر دەبەخشێت، چونکە دەڵێت: خودا پاداشتم دەداتەوە و لێم ڕازی دەبێت و خۆشەویستی ئەو بەدەستدێنم و.....، یان کارە خراپەکان ناکات، چونکە دەڵێت: خودا لێم تووڕە دەبێت و خۆشەویستی ئەو لەدەستدەدەم و سزام دەدات و.....،

**کەواتە لەسەر هەموو ئاستەکاندا مرۆڤ پێویستی بە بوونی بیروباوەڕ هەیە: تاك، خێزان، کۆمەڵگە، عەقڵ، ڕووح، کردار، گوفتار،....**

**١- پێویستی عەقڵ بۆ زانینی ڕاستییە گەورەکان لە بووندا، بۆ نموونە: لەکوێوە هاتووین و بۆ کوێ دەچین و بۆ چی هاتووین؟**

**٢- سروشت (فیطرەت)ی مرۆڤ پێویستی بە بیروباوەڕە و عەقیدە هەیە، چونکە بێ بیروباوەڕ وەڵامی فیترەتی مرۆڤ نادرێتەوە.**

**٣- پێویستی مرۆڤ بۆ دەروونێکی تەندروست و هێزی ڕووحی، کە بەبێ بیروباوەڕ نایەتەدی.**

**٤- پێویستی کۆمەڵگە بۆ پاڵنەر و (البواعث والدوافع) و ڕێکخەرە ڕەوشتییەکان، کە بەبێ بیروباوەڕ نایەتەدی.**

**٥- پێویستی کۆمەڵگە بۆ هاریکاری و یەکگرتن، کە بەبێ بیروباوەڕ نایەتەدی.**

## پێناسە و ناساندنێکی زۆر کورت و پوخت بۆ ئیسلام

ئیسلام: بریتییە لە پەیامێکی خودایی و سیستمێکی گشتی و یاساییێکی گشتگیر بۆ تاك، خێزان، کۆمەڵگە، گەل، نەتەوە، دەوڵەت، مرۆڤایەتی و جیهان، کار دەکات لەسەر هەرسێ بەشەکەی مرۆڤ: (عەقڵ و ڕووح و جەستە)، یان بڵێین (عەقڵ، بیر، فکر، ناخ، ڕووح، خوڕەوشت، کردار، گوفتار و مامەڵە)، بەشێوەیەك هەوڵ دەدات ڕێنماییەکی تەواو و ڕێکوپێك و جوانی هەموو ئەم بەشانە بکات و کەموکوڕی و ناتەواوی و ناشیرینی ئەو بەشانە نەهێڵێت و لەسەر فیترەت بیانهێڵێتەوە و پەروەردەیان بکات، بەشێوەیەك کە لە خزمەت مرۆڤ و مرۆڤایەتی و خودای گەورەدا بەکاریان بێنێت و دنیاو دواڕۆژیان پێ ڕووناك بکاتەوە. ئینجا کە مرۆڤێکی بەم شێوە جوانە پەروەردە کرد، ڕاستەوخۆ خێزان و کۆمەڵگە و گەل و نەتەوە و دەوڵەت و جیهان پەروەردە دەبێت و دەکەونە سەر ڕێڕەوێکی دروست و هاوسەنگ.

### * بوارەکانی کارکردنی ئیسلام

لەپێشەوە گوتمان ئیسلام کار لەسەر تاك، خێزان، کۆمەڵگە، نەتەوە، گەل و دەوڵەت دەکات، بەشێوەیەك کە سیستەم و بەرنامە بۆ هەموویان دادەنێت بەبێ ئەوەی تێکگیران ڕووبدات لەگەڵ عەقڵ، فکر، سروشت، ڕووح، ناخ و لاشە و مامەڵەیان،

بەڵام لەکۆتاییدا هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ مرۆڤ خۆی وەك تاك، بۆیە لێرەدا باسی مرۆڤ دەکەین.

*** بەشە سەرەکییەکانی مرۆڤ و ڕێنمایی ئیسلام بۆیان:**

**١. عەقـڵ:** ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنموونی عەقڵ و فکر. وەڵامی تەواوی پێیە بۆ پرسیارە عەقڵی و فکری و فەلسەفییەکان، بەشێوەیەك هیچ شتێك نابینیت لە بنەما نەگۆڕەکانی ئیسلام کە لەگەڵ عەقڵ تێك بگیرێن. بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە ئیسلام بەرنامە و وەڵامی تەواوی پێیە، قورئان و سوننەتە. هەروەها هەبوونی زانستێکی گرنگ و فراوان بەناوی زانستی بیروباوەڕ (علم العقيدة الإسلامية) (علم الكلام). دواتر هەبوونی فکر و فەلسەفەی ئیسلامی، کە هەر یەکێکیان بە سەدان و هەزاران پەرتووکی لەبارەیەوە نووسراوە، بۆیە هیچ بابەتێکی عەقیدەیی، فکری، فەلسەفی و زانستی نابینیت کە زانایان و بیرمەندان و فەیلوسوفان لێی نەدوابن و پەرتووك و توێژینەوەیان لەبارەیەوە نەنوسیبێت. هەروەك لە ئیسلامدا ڕێگری لە بیرکردنەوە و عەقڵ بەکارهینان نەکراوە، بەڵکوو فەرمانی بەکارهێنانی پێ کراوە. هەروەها هەموو شتێك کە زیان بە عەقڵ و بیر و هۆش بگەیەنێت، یاساغ و حەرام کراوە. بۆنموونە مادده هۆش بەرەکان. کەواتە ئیسلام بەشە سەرەکییەکەی مرۆڤی پشتگوێ نەخست کە بریتییە لە عەقڵ.

**٢. ڕووح و ناخ:** ئیسلام بەرنامەیەکی تێر و تەسەل و جوانی هەیە بۆ ڕێنمونی کردن و ئاراستەکردنی ڕووح و دڵ و دەروون، هەروەها ناتەواوی و ناڕێکی و کەموکوڕی و بۆشاییەکانی بۆ پڕدەکاتەوە، بۆیە هیچ شتێك نابینی لە ئیسلامدا کە لەگەڵ ڕووح و ناخ، دڵ و دەروون، فیترەت و خوڕەوشت و ئاکاری مرۆڤدا نەگونجێت و تێك بگیرێت. بەڵگەش لەسەر ئەمە قورئان و سوننەتە، هەروەها هەبوونی زانستێك بەناوی زاستی پاککردنەوەی ڕووح و دڵ و دەرون (علم تزكية النفس)، یان زانستی ڕەوشت (علم الاخلاق)، کە کار دەکات لەسەر ئەوەی پێویستە مرۆڤ خۆی بە هەموو ڕەوشتێکی جوان و باش برازێنێتەوە لە ناوەوەو لە دەرەوەی خۆیدا. هەروەها خۆی دارنێت و دوورکەوێتەوە لە هەموو ڕەوشتێکی ناشرین و خراپ لە ناوەوە و لە دەرەوەی.کەواتە ئیسلام ئەو بەشە سەرەکییەی تری مرۆڤی پشت گوێ نەخست و گرنگیەکی تەواوی پێ داوە و ڕێنمایی تەواوی کردووە و بۆشاییەکانی پڕکردووەتەوە و هیچ شتێکی تێدا نییە کە لەگەڵیدا تێك بگیرێت، بۆیە ئەو بەشەش کە جوان و ڕێکوپێك بوو، ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی ئەرێنی و جوان و باشی دەبێت لەسەر گوفتار و ڕەفتار.

**٣. لاشە و جەستە و ئەندامە دیارەکان:** ئەم لایەنەش دەبێت بە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** پەیوەندی مرۆڤ بە خوداوە

**دووەم:** پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤەوە

## یەکەم: پەیوەندی مرۆڤە بە خوداوە:

خۆی لە پەرستشەکان (العبادات) دا دەبینێتە وەك: نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات و... هتد، ئیسلام گرنگییەکی زۆری پێ داوە و بەرنامە و سیستمێکی تایبەتی بۆ داناوە، هەم لەڕێی قورئان و هەم لەڕێی سوننەت و پاشان هەم لەڕێی زانایان و دانانی زانستێك بەناوی (فیقه) (علم الفقه الإسلامي)، کە بە سەدان و هەزاران پەرتووکی لەبارەیەوە نووسراوە و هیچ شتێکی شاراوە نەماوە قسەی تێدا نەکردبێت. کەواتە ئیسلام ئەو بەشەی مرۆڤیشی پشتگوێ نەخستووە، بەڵکوو زۆر بەجوانی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودای گەورەی ڕێکخستووە.

## دووەم: پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان (المعاملات):

ئیسلام زۆر بەجوانی و ڕێکوپێکی بەرنامەی بۆ داناوە، بەشێوەیەك کە هیچ شتێکی تێدا نییە کە لەگەڵ مرۆڤ و مرۆڤایەتی، عەقڵ، سروشت، فیترەت، ڕووح و ناخی مرۆڤدا نەگونجێت. ئەم بەرنامە و گرنگی پێدانە هەم لە قورئان، هەم لە سوننەت و هەم لە زانستی (فقه) بوونی هەیە. بۆنموونە ئەو یاسانەی ئەمڕۆ باون و کاریان پێ دەکرێت لە جیهاندا، هەموویان یاسای زۆر جوانتر، باشتر، ڕێکوپێکتر و تێروتەسەلتر لە ئیسلامدا بوونیان هەیە، وەك:

١. یاسای باری کەسێتی (قانون الاحوال الشخصيه)

٢. یاسای شارستانی (القانون المدني)

٣. یاسای دادبینی (قانون المرافعات)

٤. یاسای تایبەتیی نێودەوڵەتی( القانون الدولي الخاص)

٥. یاسای گشتیی نێودەڵەتی (القانون الدولي العام)

٦. یاسای دەستووری (القانون الدستوري)

٧. یاسای دارایی (القانون المالي)

٨. یاسای تاوانکاری ( القانون الجنائي)

بۆیە بینیمان کە ئیسلام بەرنامەی تەواو و جوان و تێروتەسەلی پێیە بۆ هەموو ئەو بوارانە، هەرشتێکیش زیانی هەبێت بۆ هەریەکێك لەم بوارانە، ئەوا یاساغ و حەرامی کردووە، هەروەها بەتەواوەتی سوود و قازانج و بەرژەوەندی تاك و خێزان، کۆمەڵگە و گەل، نەتەوە و دەوڵەتی ڕەچاو کردووە و هیچ شتێکی دانەناوە کە زیانی بۆ ئەوانە هەبێت و تێك بگیرێت لەگەڵیاندا، بەڵکوو هەرچی سوودی هەیە بۆی داناون و ڕێگری لێ نەکردوون.

### * تایبەتمەندییە گشتییەکانی ئیسلام

١. سەرچاوەکەی خوداییە.

٢. پەیامەکەی گشتی و جیهانییە بۆ هەموو مرۆڤ و کات و شوێن و سیستمەکان و...

٣. بەرنامەکەی گشتگیرە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان.

٤. واقیعییە و ڕەچاوی بارودۆخ و کات و شوێنەکان دەکات.

٥. میانڕەوە و دوورە لە زیادەڕەوی و کورتڕەوی.

٦. ڕوون و ئاشکرا و ڕاشکاوە.

٧. کۆکەرەوی نەگۆڕەکانی خۆی و گۆڕاو و گۆڕانکاری سەردەمەکانە.

٨. مرۆڤ دۆستە و لەگەڵ هەموو بەشەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەگونجێت.

### * ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام

١. پەروەردەکردن و دروستکردنی مروڤێکی باش، بەڕەوشت، چاکەخواز و تۆکمە، بە هەرسێ بەشەکەیەوە: عەقڵ و رۆح و جەستە.

٢. پەروەردەکردن و دروستکردنی خیزانێکی باش و بەڕەوشت و چاکەخواز و تۆکمە، بە هەرسێ بەشەکەیەوە: عەقڵ و رۆح و جەستە.

٣. پەروەردەکردن و دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی باش، بەڕەوشت، چاکەخواز، شارستانی و تۆکمە، بە هەرسێ بەشەکەیەوە: عەقڵ و رۆح و جەستە.

٤. دروستکردنی دەوڵەتێکی باش، بەڕەوشت، چاکەخواز، دادپەروەر و مەدەنی.

کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلام تاکە بەرنامەیە کە هەموو بوارەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی تێدایە بەبێ ئەوەی لەگەڵ عەقڵ، بیر و هزر، ناخ و رووح، خوڕەوشت و کردار، گوفتار و مامەڵە، دونیا و دوارۆژدا هیچ تێکگیرانێکی هەبێت. نەك هەر تێکگیرانی نییە، بەڵکو ڕێنمایی تەواو و ڕێکوپێك و جوان و تێروتەسەلی تیدایە بۆیان[1].

---

(١) ئەو دابەشکارییەی باسمانکرد (عەقڵ، ڕووح، جەستە)، لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ هەڵێنجراوە، چونکە پێغەمبەر ﷺیش هەمان دابەشکاری کردووە، لەوێدا ئیسلامی تایبەتکردووە بە لایەنی جەستەیی و کردەیی، ئیمانیش بۆ لایەنی عەقڵی و فکری، ئیحسانیش بۆ لایەنی ڕووحی و ناخ.
پێغەمبەری خوا r دەربارەی ئیسلام فەرموویەتی:
١- «بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدَاً رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ». أخرجه مسلم ١٥١، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ t.
واتە: ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزرێنراوە: شایەتمان بەوە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی دیکە (بە هەق) نییە، موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەنجامدانی پێنج نوێژ (لە ڕۆژێکدا)، زەکات دەرکردن لە ماڵ و سامان، حەجی ماڵی خوا (ئەگەر توانا هەبوو)، ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان.
لێرەدا پێغەمبەر ﷺ بازنەی ئیسلامی تایبەتکردووە بە لایەنی عەمەلی و کردەیی، کە بە زمان جەستە دەکرێت: شایەتمان، پێنج نوێژ (لە ڕۆژێکدا)، زەکات دەرکردن لە ماڵ و سامان، حەجی ماڵی خوا (ئەگەر توانا هەبوو)، ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان. کەواتە دەبێتە (فیقە و شەریعەت).

پێغەمبەری خوا r دەربارەی ئیمان فەرموویەتی:

٢- «الإِيـْمَانُ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّه، وَمَلاَئِكَتِه، وَكُتُبِه، وَرُسُله، وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ». أَخرجه مسلم ١٥١، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ t..
واتە: ئیمان بریتیە لەوەی کە: بڕوات هەبێ بە خوا، بە فریشتەکانی خوا، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرەکانی خوا، بە ڕۆژی دوایی، وە بڕوات هەبێ بە قەدەری خوا بە چاك و بە خراپییەوە.
لێرەدا پێغەمبەر ﷺ ئیمانی تایبەتکردووە بە لایەنی فکری و عەقڵی، چونکە هەموویان پەیوەندییان بە باوەڕەوە هەیە. کەواتە دەبێتە (عەقیدە).
پێغەمبەری خوا r دەربارەی ئیحسان فەرموویەتی:

٣- «الإِحْسَانُ: أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَـأَنَّـكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ». أخرجه مسلم ١٥١، عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ t..
واتە: ئیحسان (کە پلەی هەرە بەرزی دینداریيە) بریتیە لەوەی کە: بە جۆرێك خوا بپەرستی وەك ئەوەی چاوت خوا ببینێ، خۆ ئەگەر تۆش خوا نەبینی، دڵنیابی ئەو دەتبینێ.
لێرەدا پێغەمبەر ﷺ ئیسحانی تایبەتکردووە بە لایەنی ڕووح و ناخەوە، کەواتە دەبێتە (ئەخلاق و تەزکیەی نەفس).
بەم پێیەش هەرسێ بەشە سەرەکیەکەی مرۆڤ (عەقڵ، ڕووح، جەستە) ی گرتەوە.

لە قورئاندا ئیسلام بە سێ مانا بەکارهاتووە:

١. دین و بەرنامەی خودا. بۆنموونە: (إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ). ال

عمران (١٩). واتە: بەڕاستی دین و ئایینی پەسەند لای خوا تەنها ئاینی ئیسلامە. هەروەها لە ئایەتێکی دیکەدا هاتووە: (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) ال عمران ( ٨٥ ). واتە: جائەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانە.

٢. تەسلیم بوون و ملکەچ بوونی تەواو بۆ خوای گەورە. بۆنموونە: (أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِ). الزمر ( ٢٢ )
واتە: جا ئایا ئەو کەسەی کە خوای میهرەبان سینەی گوشاد کردووە بۆ ئیسلام و لەسەر ڕێبازی نوور و ڕوناکی پەروەردگاریەتی، (وەك ئەو کەسە وایە کە پێچەوانەیە؟).

٣. پابەندبوونی ڕووکەشی بە ئیسلام، وەك دووڕووەکان. بۆنموونە: (يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ). الحجرات ( ١٧ )

واتە: ئەوانە منەت دەکەن بەسەر تۆدا کە گوایە موسڵمان بوون، پێیان بڵێ: منەت مەکەن بەسەرمدا لەسەر موسڵمان بوونەکەتان، بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەر ئێوەدا کە هیدایەتی داون بۆ ئیمان و باوەڕ ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن.
جیاوازی ئیسلام ئیمان
لەم بارەیەوە سێ بۆچوونمان هەیە:
١. ئیسلام و ئیمان یەك شتن و جیاوازییان نیە، ئیسلام ئیمانە و ئیمان ئیسلامە.

## ئیمـان

ئیمان بریتییە لەو نوور و ڕۆشناییەی کە لە عەقڵدا جێگیر دەبێت، پاشان شۆڕ دەبێتەوە بۆ دڵ و پاشان دێتە سەر زمان و پاشان لە کار و کردەوە و ڕەفتار و گوفتاردا ڕەنگ دەداتەوە.

**کەواتە: عەقڵ+ دڵ+ زمان+ جەستە = ئیمان**

ئیمانی تەواو و کامڵ دەبێت لە هەرچوار بەشەکە جێگیر ببێت، چونکە:

١. عەقڵ، شوێنی زانین و بیرکردنەوەیە.

٢. دڵ، شوێنی ویستن و بڕیاردانە.

٣. زمان، شوێنی دانپێدانانە.

---

٢. ئیسلام شتە کردەیی و زاهیرییەکانە، وەك: نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات، ....، بەڵام ئیمان شتە فکریی و عەقیدەییەکانە، وەك: باوەڕ بە خودا و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و ... .

٣. هەر کاتێ بەیەکەوە بوون، بەیەکەوە هاتن، ئەو کات مانایان جیاوازە، ئیمان شتە فکرییەکان دەگرێتەوە، ئیسلامیش شتە زاهیریی و کردەییەکان، بەڵام ئەگەر هەر یەکەیان بەتەنها هات، ئەوکات مەبەست لێیان هەردووك ماناکەیە، واتە ئەگەر ئیسلام بە تەنها هات ئیمانیش دەگەرێتەوە، ئەگەر ئیمانیش بەتەنها هات ئەوە ئیسلامیش دەگرێتەوە.




٤. جەستە، شوێنی جێبەجێ کردن و پراکتیزەکردنە.

کەواتە ئیمانی ڕاستەقینە و تەواو و کامڵ چوارشتە: زانین، ویستن، دانپێدانان و جێبەجێکردن.

هەر یەکێکیشیان شێواز و میکامزمی خۆی هەیە.

* کاریگەرییەکانی ئیمان لەسەر مرۆڤ، مرۆڤایەتی، تاك، خێزان، کۆمەڵگە، سیاسیەت، ئابووری و...

١- دۆزینەوەی خود و وننەبوونی

٢- ئارامی و چەسپاوی فیکری

٣- ئارامی و چەسپاوی دەروونی و ڕووحی

٤- ئارامی و چەسپاوی جەستەیی

٥- ئارامی و چەسپاوی خێزانی

٦- ئارامی و چەسپاوی کۆمەڵایەتی

٧- ئارامی و چەسپاوی ئابووری

٨- ئارامی و چەسپاوی سیاسی

٩- ئارامی و چەسپاوی نەتەوەیی

١٠- ئارامی و چەسپاوی جیهانی

١١- گەشبینی

١٢- هەبوون و پەیداکردن و پاراستنی ڕەوشت

١٣- وەڵامدانەوەی فیترەت و سروشتی مرۆڤ

١٤- وەڵامدانەوە و ڕێزگرتن لە عەقڵ

١٥- چاکەکاری

١٦- زیندوویەتی دڵ و دەروون و پاراستنی لە مردن و لاوازبوون

١٧- هەستی بەرپرسیارێتی

١٨- نەرمونیانی و بێفیزی

١٩- سەربەرزی وعیززەت

٢٠- غیرەت و چاونەترسی و ئازایەتی

٢١- بەخشین و قوربانیدان

٢٢- دوورکەوتنەوە لە خۆپەرستی

٢٣- دڵسۆزی (الإخلاص)

٢٤- ئازادی، دوورکەوتنەوە لە خۆپەرستی و خەڵك پەرستی و شت پەرستی

٢٥- زامنبوونی ژیانێکی زۆر خۆش لە دونیا و دوارِۆژدا

٢٦- بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودای گەورە

## * نیشانەکانی لاوازیی ئیمان

١. گوناھ و تاوان

٢. ھەستکردن بە دڵڕەقی

٣. نەبوونی وردەکاری لە عیبادەت و پەرستشدا

٤. گرنگیدانی لە ڕادەبەدەر بە ماددیات

٥. زۆر دڵ پەیوەستبوون بە دونیا

٦. نەبوون و تێکدان و لاوزکردنی برایەتی

٧. گرنگی نەدان بە کاروباری موسوڵمانان

٨. بەسوك سەیرکردنی چاکە

٩. قسەی بێ کردار

١٠. ڕژدی و ڕەزیلی

١١. حەزی خۆدەرخستنی ڕیابازانە

١٢. تووڕەنەبوون لە کاتی شکاندنی سنوورەکانی خودا

١٣. دوورنەکەوتنەوە لە حەرامکراوەکان

١٤. غافڵبوون و بێئاگایی لە خودا و زیکر و مناجات و خەڵوەت

١٥. کاریگەرنەبوون بە قورئان

١٦. بیرنەکردوە لە مردن

١٧. تەمبەڵی لە عیبادەت و پەرستشدا

١٨. دڵتەنگی و غەمباری بێ هۆکار

١٩. زاڵنەبوون بەسەر نەفسدا

٢٠. ترسان لە مردن

### * هۆکارەکانی لاوازیی ئیمان

١. نەناسینی خودا بە باشی و جوانی

٢. زۆر سەرقاڵبوون بە دونیا

٣. دوورکەوتنەوە لە ژینگەی ئیمانی

٤. هاوڕێی خراپ

٥. نەبوونی پێشەنگی جوان و باش

٦. سەرقاڵی لە ڕادەبەدەر بە ماڵ و سامان و خێزان

٧. نەزەرکردن و سەیریکردنی ڕەگەزی بەرامبەر بەچاوی خراپ و شەهوەت و ئارەزوو

٨. بیرنەکردنەوە لە مردن

٩. دووری لە زانستی بەسوود

١٠. کەمی پەرستش و عیبادەت

## * هۆکار و پاڵنەرەکانی بەهێزکردنی ئیمان

١. ناسینی خودا وەك خۆی

٢. بیروباوەڕ و عەقیدەیەکی ڕاست و دروست

٣. دەستگرتن بە قورئان و تێگەیشتن لێی

٤. زیکر

٥. موناجات

٦. خەڵوەت

٧. نزا

٨. موحاسەبەکردنی نەفس

٩. چاودرێری کردنی نەفس

١٠. ملنەدان بۆ نەفس

١١. هاوڕێی باش

١٢. پەرەوەردەی باش و جوان

١٣. مەرجدانان لەسەر خۆت بەوەی کە ئەم چاکەیە بکەم و ئەو خراپەیە نەکەم

١٤. بەگەورەدانانی سنوورەکانی خودا

١٥. بیرکردنەوە لە مردن

١٦. بیرکردنەوە لە کەمی دونیا

١٧. بیرکردنەوە لە دروستکراو و گەورەیی خودا

١٨. جۆراوجۆری لە عیبادەت و پەرستشدا

١٩. مەجلیسی زیکر و فکر

**بۆیە ئیمان نەك لای موسڵمان، لای غەیری ئەوانیش جێی بایەخ بووە:**

* ئەنیشتاین دەڵێت: زانست بەبێ ئایین شەلە، ئایین بەبێ زانست کوێرە.

* شیشرۆن ( نووسەر و وتاربێژی گەورەی ڕۆما ) دەڵێت:

**هیچ ئومەتێك نییە لە دونیادا، چەند دڕندەش بووبێت، کە خودایەکی نەبووبێت و خەریکی پەرستنی نەبووبێت، با نەیشیزانیبێت ئەو خودایە چییە و چۆنە.**

* ئەنیشتاین دەڵێت: زۆربەی زۆری زانا ناسراو و بەناوبانگەکانی شارستانییەتی ڕۆژئاوا پێش سەدەی هەژدە خاوەن باوەڕێکی زۆر بەهێز و دامەزراو بوون بەرانبەر خودا، بۆ نموونە لەوانە: کۆپەرنیکۆس، گالیلۆ، کیپلەر، نیوتن، پاکۆن، دیکارت.

* پاسکال دەڵێت: هیچ شتێك لە ژیانمدا نەبووە کە تامەزرۆ بم بۆ ناسینی بە ئەندازەی خودا، ئەو خودایەی کە هەستی پێ دەکەم لە ناخمدا یان لە کاتی تێڕامان لە گەردوون.




* پلۆتارك (مێژوونووسی گەورەی یونان) دەڵێت: خەریکە بڵێم ئەوە ئاسانە خەڵکی بتوانن لە وردە زیخ شارێك بنێن بەیەکەوە، بەڵام ئاسان نییە کۆمەڵێك مرۆڤ گرێ بدەی بەیەکەوە کە بڕوایان بە خوداوەند نەبێت.

کۆپەرنیکۆس دەڵێت: سوپاسی پەروردگار و دروستکارمان دەکەم کە ڕێیدام جوانی درووستکراوەکانی ببینم.

* فیرنر هایزنبێرگ دەڵێت: زانست مرۆڤ لە خودا نزیك دەکاتەوە.

کەواتە ئیمان بریتییە لەو نور و ڕۆشنیاییەی کە لە عەقڵدا جێگیر دەبێت، پاشان شۆڕ دەبێتەوە بۆ دڵ و پاشان دێتە سەر زمان و پاشان لە کار و کردەوە و ڕەفتار و گوفتاردا ڕەنگ دەداتەوە.

کەواتە لە کۆتاییدا ئیمانی ڕاستەقینە و تەواو و کامڵ چوار شتە: زانین، ویستن، دانپێدانان، جێبەجێکردن.

لە هەمووی گرنگتر، ڕزگارکردنی ئیمانمانە لە دەستی تەقلید و چاولێکەری و بردنییەتی بەرەو کەناری ئارامی و دەریای یەقین.

## ئیمان و ئەخلاق

بەپێچەوانەی تەوژمە ناباوەڕییەکە کە دەیوت: مرۆڤ و سروشت و مادده هەر یەك شتن و مرۆڤ چڵکی کیمیاییە و ماددەیەکی پیسە، ئیمان پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ ڕەوشتدا هەیە، چونکە لای باوەڕداران مرۆڤ دروستکراوی خودای گەورە و ڕێزلێگیراو و هەڵبژاردەی خودایە لە تەواوی ئایینەکاندا، وە هەموو باوەڕدارەکان بە نائایینییەکانیشەوە جیاوازییەکی تەواو دەکەن لەنێوان مرۆڤ و شتەکانی دیکەدا.

لە باوەڕدا مرۆڤ تەنیا نییە و خاوەنی هەیە کە خودایە، بەوەش باوەڕ ئامانجی دەبێت و ئومێد لەسەر خودا هەڵئەچنێت، وە بەو پێیەش کە خودا لە زیهنی تاکدا بوونی هەبوو و باوەڕی بە زیندووبوونەوە و دووبارە ژیانکردن و لێپرسینەوە هەبوو، ئەوا مرۆڤ کائینێکی پڕاوپڕ ئەخلاقی و ماقووڵ دەردەچێت و لە سزای خراپەکانی دەترسێت و دڵی بە چاکەکانی خۆش دەبێت.

وە ئەگەر هاتوو کەسەکە ئایینداریێکی باوەڕ پتەو بوو، ئەوە کەمترین زیان بە ژینگە مرۆییەکەی خۆی دەگەیەنێت و باوەڕەکەی وەك کۆت لە پاڵنەرە شەڕەنگێزییەکانی دەهاڵێت و ڕێی لێدەگرێت تا دەست بۆ نەویستراو و قێزەونەکان درێژ بکات، دیارە ڕوونە مەبەستمان نییە بڵێین: ئەوەی ئاییندار بوو،

ئەوە هەبوویەکی تەواو ئەخلاقی و بێکەموکورتییە، بەڵکو دەشێت هەندێك جار ناباوەڕێك لە خوداباوەڕێك ئەخلاقیتر بێت، بەڵام بەشێوەیکی گشتی باوەڕداران و ئایینداران ئەخلاقی و قبوڵکراوترن تا ناباوەڕان، ئەسڵەن ناباوەڕان و مولحیدان لێیان نایەت ئەخلاقی بن، چونکە باوەڕداران بنەما ئەخلاقییەکانیان لە خوداوە وەرگرتووە، بەڵام ناباوەڕان هیچ بنەما و ئەخلاقنامەیەکیان نییە.(١)

## ئەخلاق لە تێڕوانینی پێغەمبەر ﷺ دا

پێغەمبەر ﷺ وەك بەرزترین و جوانترین نموونەی ئەخلاقی بوون دەیان و سەدان کردەوە و وتەی هەیە دەربارەی ئەخلاق و پەیوەندی بە ئیمانەوە، ئێمە لێرەدا هەندێ لە وتەکانی دەخەینەڕوو، بۆئەوەی ڕوونببێتەوە کە ئەخلاق و ئیمان دوانەیەکی لێکدانەبڕاون و پێویستە بەیەکەوەبن و لێکدانەبڕدرێن.

جوانی و باشی و خێر و چاکە چاکی و جوانی ئەخلاق و ڕەوشتە

((الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ)).(٢)

(چاکە واتا جوانی ڕەوشت).

بەدوای ئەخلاق و سیفەتە بەرز و جوانەکانەوە بە

---

(١) ئیلحاد وەك خۆی: صلاح الدين أحمد.

(٢) رواه مسلم عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ ٢٥٥٣.

((إِنَّ اللَّهَ كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ، جَوَادٌ يُحِبُّ الْجُودَةَ، وَيُحِبُّ مَعَالِيَ الأَخْلاقِ، وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا)).[١]

(خوای گەورە بەخشندەیە و بەخشندەیی خۆش دەوێت و خێرومەندە و خێروومەندانی خۆش دەوێت حەزی لە ڕەوشتە بەرزەکانەو ڕقی لە ڕەوشتە نزمەکان دەبێتەوە).

ئەخلاق جوانی عیبادەت و پەرستشە

((إن المؤمنَ لَيُدْرِكُ بحُسْنِ خُلُقِه درجةَ الصائمِ القائمِ)).[٢]

(بەدڵنیاییەوە ئیماندار بەهۆی ڕەوشت و ئاکاری جوانی دەگات بە پلەی ئەو کەسەی بەردەوام بەڕۆژووە و بەردەوام شەونوێژ دەکات).

لەگەڵ خەڵکدا بە ڕەوشتی جوان مامەڵە بکە

((خالِقِ النَّاسَ بخُلُقٍ حَسنٍ)).[٣]

((لەگەڵ خەڵکدا بە ڕەوشتی جوان مامەڵە بکە)).

سەیرکە بزانە چ شتێك لە تەرازووی چاکەدا قورسترینە

---

(١) صحيح الجامع عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، (١٨٠٠).

(٢) رواه أبو داود عن عائشة، ٤٧٩٨.

(٣) رواه أحمد عن أبى ذر ٢٣٩٢، والترمذى ١٩٨٧.

ما من شيءٍ أثقلُ في الميزان من خُلقٍ حسنٍ.[١]

((هیچ شتێك نییە لە تەرازووی چاكەكاندا قورستر بێت لە ڕەوشتی جوان)).

كامڵترین ئیماندار ئەو كەسەیە كە ئەخلاقی كامڵترینە

((أكْملُ المؤمنينَ إيمانًا أحسنُهُم خلقًا)).[٢]

(كامڵترین و پەسەندترین ئیماندار ئەو كەسەیە كە ئەخلاق و خوڕەوشتی جوانترین و پەسەندترینە).

جوانی و نابووتیت پەیوەستە بە ئەخلاقەوە

((إنَّ أَبغَضَكُم إليَّ، وأَبعَدَكُم مِنِّي في الآخِرَةِ: أَسوَؤُكُم أخلاقًا))[٣].

(لە ڕۆژی دواییدا بوغزاوترین و ناشیرینترین و نابووتترن و دوورترین كەس لەمن ئەو كەسەیە كە ئەخلاقی نابووترین و ناشرین ترین و خراپترینە)[٤]

لە كۆمەڵە فەرموودەیەكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ ئیمان و ئیمانداریەتی و موسڵمانیەتی و ڕەزامەندی خودا و بەهەشت و

---

(١) رواه أبو داود عن أبي درداء ٤٧٩٩.

(٢) أخرجه أبو داود (٤٦٨٢)، والترمذي (١١٦٢)، وأحمد (٢/ ٤٧٢) واللفظ له، وحكمه حسن صحيح.

(٣) صحيح الترغيب ٢٦٦٢.

(٤) فەرموودە و ئایەت یەكجار زۆر بەڵام ئێمە بەوەندە ئیكتیفمان كرد.

دۆزەخ و ....، دەبەستێتەوە بە ئەخلاق و ئەخلاقیبوون و سیفەت و ئاکار و کار و کردەوەی جوان و باش و بەرز:

((الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِه))[١].

((موسڵمانی-تەواو-ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان و لە دەستی سەلامەت بن)).

((لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ))[٢].

((ئیمانی هیچ یەکێك لە ئێوە تەواو نابێت تاوەکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ براکەشی پێ ی خۆش بێ)).

((لَا تَبَاغَضُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إِخْوَانًا، وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ))[٣].

((ڕق و قینە بەرامبەر بە یەکتری مەنوێنن، وە حەسودی بە یەکتری مەبەن، وە پشت لەیەکتر هەڵمەکەن، ببن بە برای یەکتر، وە دروست نییە بۆ هیچ موسڵمانێك پشت بکات لە براکەی لە دوای سێ ڕۆژ)).

((الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ القِيَامَةِ))[٤].

((زوڵم و ستەم دەبێتە تاریکایی لە ڕۆژی دوایی دا)).

---

(١) رواه البخاري عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ١٠.
(٢) رواه البخاري عَنْ أَنَس ١٣.
(٣) رواه مسلم عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالك ٢٥٥٨.
(٤) رواه البخاري عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ٢٤٤٧.




((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ))[١].

((ئەو کەسەی قسە دەهێنێت و دەبات - دووزمانی دەکات - ناچێتە بەهەشت)).

((لَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ))[٢].

((ناچێتە بەهەشتەوە ئەو کەسەی کە-پەیوەندی خزمایەتی- پچڕاندبێت)).

((لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ، الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ))[٣].

((ناچێتە بەهەشتەوە هەر کەسێك مسقاڵە زەڕەیەك خۆ بەگەورە زانینی لە دڵ دا هەبێت، خۆبەگەورە زانین ئەوەیە کە حەق ڕەتبکەیەوە و وەری نەگریت وە خەڵکی بە کەم بزانی))

((لَيْسَ الْمُؤْمِنُ الَّذِى يَشْبَعُ وَجَارُهُ جَائِعٌ إِلَى جَنْبِهِ وَهُوَ يَعْلَمُ بِهِ))[٤].

((ئەو کەسە ئیماندار نییە کە وا خۆی تێرە و دراوسێکەی بە لاشانییەوە برسییە و ئەمیش پێی دەزانێت)).

---

(١) رواه مسلم عَنْ حُذَيْفَةُ ١٠٥.
(٢) رواه البخاري عَنْ جُبَيَرْ بْنَ مُطْعم ٥٩٨٤.
(٣) رواه مسلم عَنْ عَبْدِ الله بْنِ مَسْعُودٍ ٩١.
(٤) صحيح الجامع الصغير رقم: (٥٥٠٥) وصحيح الأدب المفرد رقم: (١١٢) وسلسلة الأحاديث الصحيحة عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، رقم (١٤٩).

((إِنَّ اللَّهَ تَعالَى عَفُوٌّ يُحِبُّ الْعَفْوَ))[١].

((خوای گەورە لێبووردەیە و حەزی بە لێبووردنە)).

((مَنْ يَكُنْ فِي حَاجَة أَخِيْهِ يَكُنِ اللهُ فِي حَاجَتِهِ))[٢].

((هەر کەسێك لە هەوڵی جێبەجێکردنی پێداویستی براکەیدا بێت ئەوا خوای گەورەیش لە جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی ئەودایە)).

((لا يَسْتَقِيمُ إيمانُ عبدٍ حتى يَسْتَقِيمَ قلبُهُ، ولا يَسْتَقِيمُ قلبُهُ حتى يَسْتَقِيمَ لسانُهُ))[٣].

((ئیمانی هیچ کەسێك ڕاست و تەواو و ڕێکوپێك نابێت هەتاوەکوو دڵی ڕاست و ڕێکوپێك و تەواو نەبێت، وە دڵیشی ڕاست و ڕێك و تەواو نابێت تاوەکوو زمانی ڕاست و ڕێك نەبێت)).

((مَن ظَلَمَ قِيدَ شِبْرٍ طُوِّقَهُ مِن سَبْعِ أَرَضِينَ))[٤].

((هەرکەسێ بستێ زەوی بەستەم داگیر بکات ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی ئەوەندە سەخت دەدرێت وەك ئەوەی هەر حەوت چینەکەی زەوی لە مل بپێچن و تەوقی بکەن)).

---

(١) حيث رقم (١٧٧٩) في صحيح الجامع عن إبن مسعود عن عبدالله بن جعفر.

(٢) حديث رقم (٦٦١٨) في صحيح الجامع عن جابر.

(٣) مسند احمد و صحيح الترغيب عن أنس بن مالك ٢٥٥٤.

(٤) متفق عليه عن عائشة.

((مَن لا يَرْحَمِ النَّاسَ، لا يَرْحَمْهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ))[١].

((هەر کەسێ ڕەحم بە خەڵکی نەکات خوای گەورەش ڕەحمی پێناکات)).

((ومَن كانَ يُؤْمِنُ باللَّهِ واليَومِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أوْ لِيَصْمت))[٢].

((هەر کەسێ باوەڕی بە خوای گەورە و ڕۆژی دوایی هەیە ئەگەر قسەی باش دەزانێت ئەوە با بیکات ئەگەرنا با بێدەنگ بێت)).

((من حسنِ إسلامِ المَرءِ تركُه ما لا يعنيه))[٣].

((یەکێ لە جوان پابەندبوونی موسوڵمان بە ئیسلامەوە بریتییە لە وازهێنان لەو شتانەی پێوەندی بە ئەوەوە نییە و شایەنی گرنگیپێدانی ئەو نین)).

((مَن كانَ يُؤْمِنُ باللَّهِ واليَومِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ))[٤].

((هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی میوانی بگرێت)).

---

(١) رواه مسلم عن جرير بن عبد الله ٢٣١٩.

(٢) رواه البخاري عن أبي هريرة ٦١٣٦.

(٣) أخرجه الترمذي (٢٣١٧)، وابن ماجه (٣٩٧٦) عن أبي هريرة.

(٤) رواه البخاري عن أبي هريرة ٤٣٦٣.

((تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ))[١].

((زەدەخەنە و ڕووخۆشیت بۆ بەرانبەرەکانت بە چاکە و خێر هەژمار دەکرێت)).

((الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ))[٢].

((گوتنی قسەی باش و خۆش و ڕێك و بەسوود خێر و چاکەیە)).

((من لم يشكرِ النَّاسَ لم يشكرِ اللَّهَ))[٣].

((هەر کەسێ سوپاسی خەڵك نەکات سوپاسی خوای گەورەش ناکات)).

((مَنْ كان سهْلًا هيِّنًا لَيِّنًا، حرَّمَهُ اللهُ على النَّارِ))[٤].

((هەر کەسێ مامەڵە و تەبیعەتی ئاسان و خۆش بێت و نەرمونیان بێت خوای گەورە ئاگری دۆزەخی لەسەر قەدەغە دەکات)).

((وخيارُكُم خيارُكُم لنسائِهِم))[٥].

((باشترینتان باشترینتانە بۆ ژن و هاوسەرەکەی)).

---

(١) رواه ابن حبان عن أبي ذر ١٩٥٦.

(٢) رواه البخاري ٢٩٨٩، ومسلم ١٠٠٩ عن أبي هريرة.

(٣) رواه أحمد عن أبي هريرة، ٢٢٢.

(٤) رواه الحاكم عن أبي هريرة ٤٣٥.

(٥) أخرجه أبو داود (٤٦٨٢)، والترمذي (١١٦٢)، وأحمد (٢/ ٤٧٢) واللفظ له، وحكمه حسن صحيح.

((إنَّ أَبغَضَكُم إليَّ، وأَبعَدَكُم مِنِّي فِي الآخِرَةِ: أَسوَؤُكُم أخلاقًا))[١].

((لە ڕۆژی دواییدا بوغزاوترین و ناشیرینترین و نابووتترن و دوورترین کەس لە من ئەو کەسەیە کە ئەخلاقی نابووتترین و ناشرینترین و خراپترینە)).

((مَن قَتَلَ نَفْسًا مُعاهَدًا لَمْ يَرِحْ رائِحَةَ الجَنَّةِ))[٢].

((هەر کەسێك پەیمانپێدراوێك بکوژێت -بەبێ تاوان- بۆنی بەهەشت ناکات)).

هەموو ئەم ئایەت و فەرموودانە بەڵگەن لەسەر گرینگیدانی زۆری ئیسلام بە ئەخلاق و پەیوەستکردنی بە ئیمان و دوارِۆژ و ڕەزامەندی خودا.

## پایەکانی بـاوەڕ (ئیمـان):

وشەی پایە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێت: (أركان) کە ئەویش جەمعی (ركن)ە، هەروەها ڕوکنی هەرشتێك بریتییە لە لاتەنیشتە هەرە بەهێزەکەی، هەروەك چۆن هەموو بینایەك لەسەر بناغەی بەهێز و جێگیر بونیاتدەنرێت، بەهەمان شێوە ئەو دینە لەسەر ئەو پایە و کۆڵەکانە بنیاتنراوە، کەس بە موسڵمان ئەژمار ناکرێت، هەتاوەکو بڕوای تەواوی بەم پایانە نەبێت و بەڕاستیان دانەنێت.

---

(١) صحيح الترغيب ٢٦٦٢.

(٢) البخاري ٣١٦٦.

هەروەها باوەڕ (ئیمان) لەڕووی زمانەوانیەوە بریتییە لە: بەڕاستدانانی تەواو و بڕاوە، بەبێ بوونی هیچ گومانێك تێیدا.

لە ڕووی شەرعەوە: بریتییە لە بەڕاستزانین بە دڵ و دانپێدانان بە زمان و کارپێکردنی بە ئەندامانی جەستە.

**پایەکانی باوەڕ شەشن کە بریتین لە:**

١- باوەڕهێنان بە خودای میهرەبان

٢- باوەڕهێنان بە فریشتەکان

٣- باوەڕهێنان بە پەڕتووکەکانی خودای میهرەبان

٤- باوەڕهێنان بە پێغەمبەران

٥- باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی

٦- باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر (خێر و شەڕی).

١- پوختەی باوەڕهێنان بە خودا بریتییە لە: باوەڕی تەواو بەوەی کە خوای گەورە حەقە و هەیە.

هەروەها تاك و تەنها و بێ هاوەڵە.

وەسفکراوە بە هەموو تەواوییەك (صفات کمال)، پاك و بێگەردە لە هەموو کەم و کوڕییەك.

تەنها و تەنها ئەو شایەنی ئەوەیە بپەرسترێت و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بکرێت.

٢- پوختەی باوەڕهێنان بەفریشتەکان بریتییە لە: باوەڕی تەواو بە هەبوونیان، باوەڕ بێنین کە لە ڕووناکی و نوور دروستکراون، هەرگیز سەرپێچی و بێ فەرمانی خودا ناکەن لە شتێك کە فەرمانیان پێ کرابێت، چیان پێبیگوترێت دەیکەن.

٣- پوختەی باوەڕهێنان بە پەرتووکەکانی خودا بریتییە لە: باوەڕبوونی تەواو بەوەی کە خوای گەورە چەندین پەرتووکی ناردووە بۆ پێغەمبەران کە هیدایەتی بەندەکان و چاکەی دونیا و قیامەتیانی تێدایە، وە ئەو پەرتووکانە وەحی خوای گەورەن و حەق و ڕاستن لەلایەن خوای گەورەوە هاتوون.

٤- پوختەی باوەڕهێنان بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بریتییە لە: باوەڕی تەواو بەوەی کە خوای گەورە بۆ هەر ئوممەت و میللەتێك پێغەمبەرێکی لە خۆیان ناردووە کە بانگیان دەکات بۆ خودا بەیەکگرتن و بە تەنها پەرستنی، ڕێنموونیان دەکەن بۆ هەموو چاکەیەك بۆ دونیا و قیامەتیان، هەروەها لە هەموو زیانێکی دونیا و قیامەتیان ئاگاداریان دەکەنەوە.

٥- پوختەی باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی بریتییە لە: باوەڕبوونی تەواو بە ڕاستی و دروستی هەموو ئەو هەواڵانەی کە خوای گەورە و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) ڕایانگەیاندووە لە بارەی هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لە دوای مردنەوە ڕوودەدەن، لەناویاندا پرسیاری ناوگۆڕ و ئەوەی بە دوای دادێت

لە زیندووکردنەوە و حەشر و حیساب و وەرگرتنەوەی پەرتووك و تەرازو و پردی سیڕات و بەهەشت و دۆزەخ.

٦- پوختەی باوەڕهێنان بە قەزا و قەدەر بریتییە لە: باوەڕبوونی تەواو بەوەی کە هەرچی ڕوودەدات لە خێر و زیان لە ژێر ویست و دەسەڵاتی خوای گەورەدایە.

## باوەڕ گشتگیرە و بەش بەش ناکرێت

باوەڕهێنان بەو شەش پایە هەمووی بەیەکەوە بەستراوە و لە یەك نابنەوە، بۆیە ئەوەی باوەڕ بە خودا بێنێت بەڵام باوەڕ بە فریشتەکان نەهێنێت، ئەوە بە باوەڕدار هەژمار ناکرێت. بە هەمان شێوە ئەوەی باوەڕی بە فریشتەکان هێناوە، بەڵام باوەڕی بە پێغەمبەران و پەرتووکەکانی خوا نەهێناوە، یان ئەوەی کە باوەڕی بەهەموو پایەکان هێناوە بەڵام باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەهێناوە، ئەوە بە باوەڕدار هەژمار ناکرێت و باوەڕدار نییە.

بێداری: هەموو ئەم بنەمایانە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی زۆریان هەیە، ئێمە لەم پەرتووکەدا زۆر بەکورتی باسیان دەکەین، بەڵام ئەوەی گرینگە ئەوەیە کە هەر یەك لەمانە تێکناگیرێت لەگەڵ عەقڵی سەلیم و ساغ و سروشتی مرۆڤ.

## بوونی خودا و هەڵوێستەکان لەبەرامبەریدا

پێش چوونە ناو باس و باوەڕ بە خودا بە پێویستی دەزانم باسی هەڵوێستەکان بکەم بەرامبەر بوونی خودا، چونکە هەڵوێستەکان لە بەرامبەریدا جیاوازن، دەتوانین دابەشیان بکەین بۆ (٨) ڕێباز و مەزهەب [١]

١- الألوهية ٢- الربوبية ٣- الإلحاد ٤- اللاأدرية ٥- الشيئية ٦- اللاأكتراثية ٧- وحدة الوجود ٨- السوفسطائية

### خودایی (الألوهی) (Theism)

باوەڕدارانی ئەم ڕێبازە باوەڕیان وایە خودا بریتییە لە زاتێکی تەواو کە هەموو سیفەتێکی تەواوی هەیە، ئەم زاتە (خودایە) پەیام و پەیامبەری ناردووە، هەروەها بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە، کەواتە دەتوانین بڵێین: مەزهەبی ئولوهی بڕوای بە چوار شتی سەرەکی هەیە:

١- بڕوابوون بە خودا، وەك دروستکاری گەردوون و بەڕێوەبەری گەردوون

---

(١) براهين وجود الله، سامي عامري، ل (٥٧) و دواتر، میلیشیا الإلحاد (مدخل لفهم الإلحاد الجديد) - عبدالله بن صالح العجيري، ل (٧٠).

٢- بڕوابوون بە پەیام و وەحی و پەرتووکی ئاسمانی

٣- بڕوابوون بە پێغەمبەرێك كە لە لایەن خوداوە نێردراوە بۆ مرۆڤایەتی.

٤- بڕوابوون بە زیندووبوونەوە و ڕۆژی دوایی

دیارە ئەوانە بریتیین لە شوێنکەوتوانی ئایینە ئاسمانییەکان، وەك (ئیسلام و مەسیحییەت و جوولەکە).

## ڕوبوبییەکان (الربوبیة)، (Deism)

ئەم ڕێبازە (مەزهەبە) بڕوای بە زاتێکە کە بریتییە لە خودا، کە ئەم گەردوونەی دروستکردووە و ئەندازەی گرتووە و ڕێکی خستووە و خستویەتییە سەر سیستەمێکی ڕێك بە شێوەیەك کە پێویستی بە ئاڕاستەکردن و ڕێنموونیکردن نەبێت، وەکوو کاتژمێر، کە دروستدەکرێ پاشان خاوەنەکەی لێی دەگەڕێ ئەویش بەپێی ئەو سیستەمەی کە تێیدایە کاردەکات بەبێ ئەوەی پێویستی بە ئاڕاستەکردن بێت.

## جیاوازی ئولوهی و ڕوبوبی:

١- ئولوهی بڕوای بە وەحی خودایی و پەرتووکی ئاسمانی هەیە، بەڵام کەسی ڕوبوبی بڕوای بە پەیامی خودایی و وەحی و پەرتووکی ئاسمانی نییە، بەڵکوو ئەوان بڕوایان بە وەحی گشتی (الوحي العام) هەیە، کە بریتییە لە ڕاستییەکانی ئەقڵ و ئاماژە

گەردوونییەکان، واتە سەرچاوەی زانیاری لای ئەوان بریتییە لە ئەقڵ و زانست، لەو دەرهاویشتەی کە لە گەردوون و ژیانەوە دەستمان دەکەوێت، بۆیە ئەوان پێیان وایە کە ئەوە ئەقڵ و زانستن خۆشبەختی و کامەرانی بە مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەدەن، نەوەك وەحی و پەیامی خودایی.

٢- ئولوهی بڕوای بە پێغەمبەری نێردراو هەیە کە لە لایەن خوداوە نێردراوە، بەڵام کەسی ڕوبوبی بە هیچ شێوەیەك بڕوای بە پێغەمبەر و پێغەمبەرایەتی نییە، واتە: بڕوایان بەوە نییە کە خودا پەیوەندی هەبێت لەگەڵ یەکێك لە مرۆڤەکان، هەر بۆیەش بڕوایان بە موعجیزە و هەموو ئەو بەڵگانەی دیکەش نییە کە پێغەمبەران لەگەڵ خۆیان هێناویانە.

٣- ئولوهی خاوەن ئایینە، بەڵام ڕوبوبی هیچ ئایینێکی نییە، پێیانوایە ئایین هی خەڵکی ساویلکە و نەزانە و لە بێدەسەڵاتی و بێزانستی خەڵکانی سەردەمی کۆن سەرچاوەی گرتووە، دەشڵێن: ئایین تەنها ئامڕازێکە بۆ جووڵاندنی عەطف و سۆزی خەڵك و ڕاکێشانیان بۆ دەسکەوتی دنیایی و ماددی.

٤- ئولوهی بڕوای بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە و لێپرسینەوەی دوارۆژ هەیە، بەڵام زۆرێك لە ڕوبوبییەکان بڕوایان بەڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە نییە.

## بێباوەڕی (الالحاد)، (Atheism)

ئەم ڕێبازە (مەزهەبە) باوەڕی بە هیچ خودا و بەدیهێنەر و دروستکارێك نییە كە ئەم گەردوونەی لە نەبوونەوە دروستكردبێت وەك باوەڕداران باوەڕیان وابوو، ناباوەڕانی كۆن پێیانوابوو ماددە ئەزەلی و هەر هەبووە و پێویستی بە هێزێكی دەرەكی نییە بۆ ئەوەی بیهێنتە بوون، بەڵام لە دوای تەكانی دووەمی فیزیا و هاتنە كایەی فیزیای سەردەمی دوای ئەنیشتاین ئەم بیروڕایە لە گۆڕنرا و سیناریۆی جیاوازیان بۆ بیروبۆچونەكانیان داهێنا، هەتا بە زمانی حاڵ نكووڵی لە هەبوونی خودا بكەن و واز لە باوەڕی تەقلیدی كۆنی خوداباوەڕی بهێنن، كە لە سیناریۆ هەرە بەهێزەكان بۆ گەردوون فرەگەردوونییە و ڕەگەكەی بە سودفە و ڕێكەوت پاڵپشتی دەكرێت، سیناریۆی هەبوونی ژیانیش پەرەسەندنە كە ڕەگەكەی سازش كردن و خۆگونجاندنیانە لەگەڵ دەروبەر (البقاء لمن انسب و اصلح).

بۆیە ئەوان باوەڕیان وا نییە كە كەسێك سەرپەرشتی گەردوون بكات و بەڕێوەیبەرێت یان پەیام و وەحی و پێغەمبەر و ئایین بنێرێت یان زیندووبوونەوە هەبێت، ئەوان هەموو ئەمانە ڕەتدەكەنەوە و بەتەواوی دژی دەوەستنەوە[١].

---

(١) ئیلحاد جۆری زۆری هەیە، ئێمە لە پەرتووكی (ئیلحاد وەك خۆی) دا ٣٦ جۆری ئیلحادمان باسكردووە.

## نازانمگەرایی (اللاأدرية)، (Agnosticism)

نازانمگەرا (لاأدری) کەسێکە کە بڕوای وایە ناتوانێت دان بە بوونی خودادا بنێت، هەروەها ناشتوانێ نەفی بکات، لەبەرئەوەی کەسی نازانمگەرا خۆی یەکلایی نەکردۆتەوە و نازانێت بەڵگەکانی هەبوون بەهێزترن یان نەبوون و لەمەڕ باسەکە نەگەیشتۆتە هیچ ئەنجامێك.

نازانمگەراکان (لائەدرییەکان) دەڵێن: شتە میتافیزیکییەکان و نادیارەکان و بەرهەست نەبووەکان و شتەکانی ئەودیو سروشت هیچ ڕێگەیەکیان نییە بۆ جێگیرکردن و ئیسپاتکردنیان وە ناشتوانرێت نەفی بکرێن، کەواتا باشترین ڕێگە ئەوەیە کە بڵێین: نازانین و خۆمانی لێ ببوێرین و بەڵگە لەسەر هەبوون یان نەبوونی نەهێنینەوە، چونکە ڕەنگە هەر دوو لا بە بڕوادار و بە بێباوەڕ بەڵگەی خۆیان هەبێت، بۆیە لە دیدی ئەوان لەوانەیە بەڵگەکانی هەر دووکیان یەکسان بن، بۆیە حوکم بە هیچ لایەکیاندا نادەن و لایەنگیری هیچ کامێکیان ناکەن نە بە ئیسپات نە بە نەفی.

## شتگەرا (الشيئية)، (Ietsism)

ڕێبازی شتگەرا (الشيئية) واتا: شتێك (شيئ) هەیە، بۆیە ئەم مەزهەبە ناڕوونییەکی تێدایە، ئەم ڕێبازە لە مەزهەبی ڕوبوبی نزیکە، بەڵام وەك ئەو نییە بەتەواوی، چونکە ڕوبوبی بڕوای بە

زاتێکی دروستکاری خاوەن سیفەتی زاتی ڕوون هەبوو، بەڵام شتگەرا (الشيئية) ناڕوونییەکی تێدایە، چونکە هەندێك کات بڕوایان نزیکە لە ڕوبوبی بەوەی کە ئەو شتە هێزێکی گەورەی دەرەکییە، بەڵام زۆر جاریش مەفهومەکەی نزیکە لە فریشتە یان هێزێکی ڕووت لە زات و سیفەت، بۆیە بەپێی سەرژمێرییەك کە لە ئەورووپا کراوە لە ساڵی (٢٠١٠) ٨٠٪ بڕوایان وا بووە کە (ڕووحێك یان هێزی ژیان) هەیە کە بە لای ئەوانەوە ئەوە بریتییە لە خودا.[١]

ئەم ڕێبازە (مەزهەبە) زیاتر بەهۆی تەمبەڵی مەعریفی سەریهەڵداوە لە ڕۆژئاوا، چونکە زۆربەیان خۆیان سەرقاڵ ناکەن بە مانا گەورە گەردوونییەکان یان پرس و پرسیارە گەورەکان و تێگەیشتن لە واتای ژیان و ئامانجەکانی و هۆکاری هاتنەبوونمان، چونکە ئەوان بەتەواوی ڕۆچوون لە ژیانی ماددی و دوورکەوتوونەتەوە لە لایەنی ڕووحی و گرنگیدان پێی، بۆیەش دەبینین لە ڕووی ڕووحی و دەروونییەوە بەتەواوی تێکشکاون و تووشی گەورەترین بۆشایی (فەراغ)ی ڕووحی و دەروونی هاتوون، بە شێوەیەك زۆرترین ڕێژەی خۆکوشتن لەوێیە، لەگەڵ ئەوەی لە زۆربەی بوارەکانی ژیان کێشەیان نییە و زۆربەی هۆکارەکانی ژیانیان بۆ فەراهەم هاتووە.

---

(١) د سامی عامری- براهين وجود الله – ٢٠١٨ – لاپەڕە ٦٨

## بێموبالات و گرنگی نەدەر (اللااکتراثیة) (Apatheis)

بێموبالات و گرنگی نەدەر بریتییە لەو کەسەی کە هیچ گرنگییەك نادات بەم بابەتانە، بۆیە ئەم ڕێبازە (مەزهەبە) هەڵوێستێکی کردەییە لە بابەتی بوونی خودا، ئەوانە بەتەواوی تێڕامان لەم بابەتەیان پشتگوێ خستووە و پێیان وا نییە ئەم بابەتە جێی گرنگی پێدان و خۆ خەریککردن بێت، بۆیە ئەوان لەسەر زەوی دەژین وەك بڵێی: خودا هەر بوونی نییە، ئەوان تێڕامان و خۆ خەریککردنیان و گرنگی دانیان تەنها بۆ شتە ماددی و سوودبەخش و چێژ بەخشەکان هەیە، کاریان بەوە نییە خەریکی شتێك بن کە بوونی نییە و سوودی نییە و چێژ بەخش نییە وەك خۆیان دەڵێن.

## یەکێتی بوون (وحدة الوجود) (pantheism)

جۆرێکی دیکەشمان هەیە پێیان وایە خودا و گەردوون یەکێکن، واتا خودا گەردوونە و گەردوون خودایە، شتێك نییە لە دەرەوەی گەردوون و سروشت بە ناوی خوداوە، بەڵکوو ئەوەی کە هەیە خودا و گەردوونە، واتە هەر دووکیان یەك شتن.

## سۆفستائی (السوفسطائیة)، (sophism)

سوفستائییەکانیش سێ جۆری سەرەکییان هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەن کە بڕوایان بە حەقیقەتی بوون نییە

و بوون و نەبوونی گەردوون بێمانایە و دەڵێن: بوون و گەردوون خەون و خەیاڵە و هیچ شتێکی ڕاستی بوونی نییە، هەتا بڕوایان بە بوونی خۆشیان نییە، ئەوانە لەنێو سوفستائییەکان بە (عندیة) بەناوبانگن. کەواتە کەسێك بڕوای بە بوون و نەبوونی خۆی نەبێت، چۆن باوەڕی بە خودا هەیە؟!

کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت هەڵوێست بەرامبەر بوونی خودا جۆراوجۆرە، بەڵام ناباوەڕی بەدرێژایی مێژوو و مێژووی فەلسەفە هەواداریێکی وای نەبووە، بۆیە ئەگەر فەیلەسوفە بێباوەڕەکان سەرمێژری بکەی، بە پەنجەی دەستان دەژمێردرێن. ئەگەر بشڕوانین باوەڕداری سەنتەر بووە لە مێژوودا، تا ناباوەڕی، چونکە:

١- مروڤ لە بنچینەدا لەسەر زگماك و خوداڕسك (فیترەت) دروستکراوە، هەر وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (ما من مولود إلا يولد على الفطرة فأبواه يهودانه أو ينصرانه أو يمجسانه)[١]، واتا: هەموو مرۆڤێك لەسەر فیترەتی پاك و ڕاستەقینە دروستدەکرێت و لە دایکدەبێت، بەڵام دەوروبەر و دایك و باوك لەسەر ئەم فیترەتە لای دەدەن و دەیکەنە جوو و نەصرانی و مەجوسی. پاشان لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنیدا مرۆڤ لە دەسەڵاتی خودا تێدەگات ئەگەر هەر لە تەنهاییشدا بێت و ئاڕاستەش نەکرێت بەرە و لای خوداناسی، وە بەڵگە و توێژینەوەکان لەسەر ئەم باسە زۆر و زەبەندەن.

---

(١) متفق عليه: البخاری ١٢٩٢، ومسلم: ٦٩٢٦.

لێرەشەوە بەشێك لە زانایانی دەروونناسی دەڵێن: چوار شت لە مرۆڤدا زگماك و خوداڕسك و فیترین و لەگەڵ سروشتی مرۆڤدان کە بریتین لە: (زانستخوازی - جوانی خوازی، چاکەخوازی - خوداپەرستی).

**٢-** مێژوونوسان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە دینداری و خوداناسی ئەسڵن و مێژوویان لەگەڵ مێژووی مرۆڤ و مرۆڤایەتیدایە، بۆ نموونە قسەیەکی بەناوبانگی مێژوونووسی گەورەی یۆنانی (پلۆتارك) هەیە دەڵێت: (زۆر شارمان لە مێژوودا بینیوە بەبێ قەڵا، شورە، کۆشك و تەلار و قوتابخانە، بەڵام هەرگیز شارێکمان نەدیوە بەبێ پەرستگا).

هەروەها فەیلەسووفی فەڕەنسی (هێنری برگرسۆن) دەڵێت: (کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دوور لە زانست و هونەر و فەلسەفە ژیانیان بەسەربردووە، بەڵام هەرگیز هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی نەبووە دوور لە ئایین ژیانیان بەسەربردبێت).[١]

**٣-** فەیلەسووفە بەناوبانگەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بڕوایان بە بوونی خودا هەبووە بۆ نموونە: (سوقڕات، ئەفلاتون، ئەرستۆ، ڤۆلتێر، فاڕابی).[٢]

---

(١) الدين، بحوث ممهد لدراسة تاريخ الأديان، عبدالله دراز، (٨٣).

(٢) االإسلام يتصدى للغرب الملحد، الدكتور محمد نبيل النشواني (١١).

**٤- مێژوونووسی گەورە (ویل دیۆرانت) لە کتێبی (قصة الحضارة)دا دەڵێت: هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەو بیروباوەڕە کۆنە ڕاست و دروستە کە دەڵێت: (ئایین دیاردەیەکە کە هەموو مرۆڤایەتی گرتۆتەوە)، واتە: خوداناسی شتێکی گشتی بووە، ئیلحاد ئەگەر هەشبووبێت شتێکی تاکە کەسی بووە و نەبووە بە دیاردە و خاوەن قوتابخانە و کۆمەڵە و مەزهەب.**

**دووەم:** فریشتەکان نەنێرن و نەمێن، وە هاوسەرگیریان لەنێواندا نیە و وەچە ناخەنەوە و ناخۆن و ناخۆنەوە و ناخەون، بەپێچەوانەی مرۆڤ کە ئەو سیفەتانەی هەن.

**سێیەم:** فریشتەکان بەویست و فەرمان و قودرەتی خوای گەورە دەتوانن خۆیان بهێننەسەر وێنەی مرۆڤ.

**چوارەم:** فریشتەکان بە سروشت و فیطری لەسەر بەندایەتی و عیبادەت دروستکراون (واتە عیبادەت بۆ ئەوان پێویستییێکی بنەڕەتیە وەکو پێویستی مرۆڤ بۆ هەناسە)، وە هەرگیز ئامادەییان تێدانیە بۆ تاوان و گوناه کردن ... بەڵام مرۆڤ هەستی حەز و ئارەزووی تێدایە بۆیە هەندێك جار وای لێدەکات تووشی گوناه و تاوان ببێ، وە بەردەوام لە ململانێ دایە لەگەڵ نەفسی خۆیی و حەز و ئارەزووەکانی، وە لەوانەیە لایەنی خێر و چاکەی زاڵ بێت بەسەر لایەنی خراپ و شەڕیدا و سەربکەوێت بەسەر حەز و ئارەزووەکانیدا، بەوەش پلەی کەسەکە بەرزدەبێتەوە بۆ پلەی فریشتەکان و بەرزتریش، هەندێك جاریش لایەنی شەڕ و خراپە لە مرۆڤدا زاڵ دەبێت بەسەر لایەنی خێر و چاکەیدا، بۆیە شکست دەهێنێت لە ململانێی لەگەڵ نەفسیدا، حەز و ئارەزووی سەردەکەوێت بەسەریدا، تاوەکو پلەی دادەبەزێت بۆ خوارەوەی ئاژەڵ.

## جیاوازی نێوان فریشتەکان و جنۆکەکان

١- فریشتەکان خوای گەورە لە ڕوناکی دروستی کردوون، بەڵام جنۆکەکان خوای گەورە لە ئاگر دروستی کردوون.

٢- فریشتەکان بە سروشتی و فیطری لەسەر بەندایەتی و عیبادەت و زیکر و ویردی خوای گەورە دروستکراون، بەڵام جنۆکە وەکو مرۆڤن چاك و خراپیان هەیە، هەروەکو چۆن مسوڵمان و کافریشیان هەیە[١].

٣- فریشتەکان هەموویان نموونەی لایەنی خێر و چاکە و سەرفرازین، بەئاراستەی بەندایەتی خوای گەورە و ڕێنموونی کردنی بەندەکان و پاراستنیان دەڕۆن و ئاراستە دەگرن، وە تکای لێخۆشبوونیان بۆ دەکەن، بەڵام شەیتانەکان کە بریتین لە جنۆکە یاخیبوو و بێباوەڕەکان ئەوانە نموونەی لایەنی خراپە و تێکدانن، حەز و ئارەزو و خراپەکان لە دڵی مرۆڤدا دەڕازێننەوە و جوانیان دەکەن و وەسوەسە و گومانیان بۆ دروست دەکەن و دەیانخەنە ناو گوناه و تاوانەوە .

## کردەوەی فریشتەکان

١- هەیانە وەحی و نیگا دادەبەزێنێت بۆ پێغەمبەران، کە ناوی جبریلە (علیەالسلام)، هاتووچۆ دەکات لەنێوان خوای گەورە و پێغەمبەرانی(علیهم الصلاه و السلام)[٢].

---

(١) الجن: ١١ _ ١٤ _ ١٥.
(٢) الشعراء: ١٩٢ _ ١٩٥.

٢- هەیانە تایبەتە بە فوکردن بە کەڕەنادا، کە ناوی ئیسرافیلە (علیه‌السلام)، دوو فوو دەکات بە کەڕەنادا بە فەرمانی خوای گەورە: یەکەمیان بۆ مراندنی زیندەوەران، دووەمیان بۆ زیندوو کردنەوەیان[١].

٣- هەیانە تایبەتە بە گیان کێشان و مردن، کە ناوی فریشتەی گیان کێشانە لەگەڵ هاوکارەکانی[٢].

٤- هەیانە لە کاتی مردنی باوەڕداران دادەبەزن و یارمەتیان دەدەن و مژدەی بەهەشتیان پێ دەدەن[٣].

٥- هەیانە بێباوەڕان دەترسێنن لەکاتی مردنیاندا وە زۆر بە توندی و ڕەقی گیانیان دەکێشن[٤].

٦- هەیانە تایبەتن بە بەهەشت، سەرپەرشتی بەهەشتیەکان و ناز و نیعمەتەکانیان دەکەن[٥].

٧- هەیانە تایبەتن بە دۆزەخ سەرپەرشتی سزادانی خەڵکی ناو دۆزەخ دەکەن[٦].

---

(١) الزمر: ٦٨.

(٢) السجدة: ١١. والأنعام: ٦١.

(٣) فصلت: ٣٠.

(٤) الأنعام: ٩٣.

(٥) الزمر: ٧٣.

(٦) التحریم: ٦.

٨- هەیانە تایبەتن بە نوسینی کردەوەکانی مرۆڤ و بەردەوام لەگەڵیانن، کردەوە و قسەکانیان تۆمار دەکەن، وە هەموو مرۆڤێك تۆمارێکی تایبەت بەخۆی هەیە لەلای ئەو فریشتانە هەموو شتێکی تێدا نوسراوە، لەڕۆژی دواییدا دەیانخەنەوە بەردەم و گەواهی و شایەتیان لەسەر دەدات(١).

٩- هەیانە تایبەتن بە پاراستنی مرۆڤ لە ماڵەوە و سەفەردا و لە ئاگایی و خەودا، وە لە هەموو دۆخێکیاندا، بەردەوام لەدوای مرۆڤەکانن(٢).

١٠- هەیانە داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەن بۆ باوەڕداران(٣).

١١- هەیانە ئامادەی دانیشتن و کۆڕەکانی یادی خوا و پەرستش و عیبادەتەکان دەبن(٤).

## فەلسەفەی باوەڕبوون بە فریشتەکان

باوەڕبوون بە فریشتەکان فەلسەفەی خۆی لە پشتە و بەروبوومی زۆری هەیە و کاریگەری باشی هەیە لەسەر ژیانی تاك، لەوانە:

---

(١) الانفطار: ١٠ _ ١١. وق: ١٧ _ ١٨.

(٢) الرعد: ١١.

(٣) غافر: ٧ _ ٨.

(٤) رواه مسلم: ٢٦٩٩، في كتاب الذكر والدعاء.

**١.** هەستکردن بە گەورەیی خودای گەورە، کە ئەو هەموو فریشتەیەی بەو هەموو توانایەوە دروست کردووە.

**٢.** بۆ تاقیکردنەوەی ئیمانی مرۆڤە، چونکە فریشتەکان بە چاو نابینرێن و دەکەونە بازنەی جیهانی پەنهانەوە (عالم الغیب) کەواتە هەر کەسێك باوەڕی پێیان هەبێت، ئەوا نیشانەی ئیمانییەتی.

**٣.** هەستکردن بە چاودێری، کە مرۆڤ زانی فریشتەکان لە گەڵنی و ئاگادارن پێیانەوە، ڕاستەوخۆ هەڵوێستەیەك دەکات.

**٤.** هەستکردن بە پشتیوانی و ئارامی، کە مرۆڤ زانی هەموو کاتێك فریشتەکان لەگەڵیدان، ڕاستەوخۆ هەستێکی مەعنەوی لە ناخییەوە هەڵدەقوڵێت و هەست بە تەنهایی ناکات لەو کاتانەی بەتەنهاشە.

**٥.** هاندانی ئیمانداران و سورکردنیان لەسەر تاعەت و عیبادەت، چونکە کە ئیماندار بیر لە فریشتەکان بکاتەوە کە چەندە خودا پەرستن ئەوانیش هاندەدرێن.

**٦.** بەهێزکردنی باوەڕی باوەڕداران بە سەرخستنی خودایی، وەك ئەوەی لە شەڕی بەدردا فریشتەکان بوون بە پشتیوانی باوەڕداران و سەریانخستن.

**٧.** بەهێزکردنی باوەڕ بە وەحی، کە فریشتەیەك دابەزیوە و وەحی بۆ پێغەمبەران هێناوە و لەگەڵیان بوون.

**٨. لەبیربوونی مردن، چونکە دەزانێت هەموو چرکە ساتێك بۆی هەیە فریشتەی گیانکێشان بێت و گیانی بکێشێت و بمرێت.**

# جنۆکەکان (الأجنة)

## پێناسە و واتای جنۆکە :

**لەڕووی زمانەوانیەوە:** جنۆکە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێت (الجن) کە لە پیتەکانی (جن) وەرگیراوە، لە بنەڕەتدا بە واتای ون و نادیار دێت، بۆیەش بەو ناوە ناونراون لەبەر ونی و نادیارییان لەبەر چاوانمان.

**لەڕووی شەرعیەوە:** بریتین لەو ڕووح و گیانانەی کە لە جەستە و لاشەی ئاگریندان، دەتوانن خۆیان بهێننە سەر وێنە و شێوەی جیاجیا، دەخۆن و دەخۆنەوە، نێر و مێیان هەیە، هاوسەرگیری دەکەن و وەچە دەخەنەوە، وە دەشمرن کۆمەڵ لەدوای کۆمەڵ.

پێویستی باوەڕبوون بەبوونی جنۆکە و حوکمی باوەڕ نەبوون بە جنۆکە

باوەڕهێنان بەبوونی جنۆکە لە پێویستیەکانی باوەڕە، وە ئینکاری کردن لە بوونیان و باوەڕنەهێنان بەبوونیان ڕەتکردنەوەی قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرە. (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)[1].

---

(١) الذاريات: ٥٦. والجن: ١ _ ٢.

## جیاوازی نێوان مرۆڤ و جنۆکە

١- مرۆڤ لە گڵ دروست کراوە، بەڵام جنۆکە لە ئاگر دروست کراوە.[١]

٢- جنۆکە پێش مرۆڤ دروست بوون[٢].

٣- جنۆکە دەتوانێت خۆی بهێنێتە سەر شێوەی جیا جیا، وەکو شێوەی مرۆڤ یان هەندێ لە ئاژەڵەکان، بەڵام مرۆڤ توانای ئەوەی نیە.

٤- جنۆکە مرۆڤ دەبینێت، بەڵام مرۆڤ جنۆکە نابینێت[٣].

٥- جنۆکە دەتوانن کاری گەورە و سەرسوڕهێنەر، وە داهێنانی بەرز و شتی زۆر قورس بکەن، لەکاتێکدا مرۆڤ ناتوانێت لەو جۆرە کارانە بکات.

## سیفەتە هاوبەشەکانی مرۆڤ و جنۆکە

١- جنۆکەکان دەخۆن و دەخۆنەوە، هاوسەرگیری دەکەن و وەچە دەخەنەوە، نێر و مێیان هەیە، مرۆڤەکانیش بەهەمان شێوە.

٢- پەیوەست بوون بە شەریعەت و یاساکانی خوای گەورە پێویستکراوە لەسەر جنۆکە و موکەلەفن پێی، وە پێویستە پابەندبن

---

(١) الذاريات: ٥٦. والجن: ١ _ ٢.

(٢) الحجر: ٢٦ _ ٢٧.

(٣) الأعراف: ٢٧.

بە هەموو فەرمانێك (بەكردن بێت یان نەكردن) لە شەرعدا، هەروەك چۆن لەسەر مرۆڤیش پێویستە، بەڵگەی ئەوەش بریتییە لەو بانگكردن و دواندنانەی كە لە قورئاندا بانگی هەردوو گرۆی ئادەمیزاد و جنۆكە دەكات و بەیەكەوە دەیاندوێنێ[١].

٣- ئەو تەحەددایایەی كە تەحەددای مرۆڤی پێكراوە لەبارەی بەرهەڵستی موعجیزەكان جنۆكەكانیش دەگرێتەوە[٢].

٤- جنۆكەكان جۆراوجۆرن لەڕووی موسڵمانی و بێباوەڕی و چاك و خراپییەوە، مۆرڤەكانیش بەهەمان شێوەن[٣].

٥- لەڕۆژی دواییدا جنۆكەكان كۆدەكرێنەوە و حەشەردەكرێن بەپێی كردەوەكانیان حیسابیان لەگەڵدا دەكرێت، چاكەكارانیان پاداشت دەدرێنەوە و خراپەكارانیان سزا دەدرێن، وە باوەڕدارانیان لە بەهەشتن و بێباوەڕانیان لە ئاگردان وەكو باروودۆخی مرۆڤەكان[٤].

جنۆكە ناتوانێت شتی پەنهان (غەیب) بزانێت[٥].

---

(١) الأنعام: ١٣٠.

(٢) الإسراء: ٦٨.

(٣) الجن: ١١ و ١٤.

(٤) الجن: ١٣. وهود: ١١٩. والسجدة: ١٣.

(٥) سبأ: ١٤. والجن: ١٠.

جنۆکە ئەو شتە پەنهانانە نازانێت کە تایبەتن بە زانستی خوای گەورە.

هەروەها ناتوانن سوود و زیان بگەیەنن[١].

جنۆکە هیچ جوڵان و هێزێکیان نیە، هەتا ناتوانن سوود و زیان بەخۆشیان بگەیەنن بەبێ ویستی خوای گەورە.

---

(١) الجن: ٦.

# شەیتانەکان (الشیاطین)

## واتا و پێناسەی شەیتان:

لەڕووی زمانەوانیەوە: لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێت (شیطان) لە هەرسێ پیتی (شطن) وەرگیراوە، کە لە بنەڕەتدا بەمانای دووری دێت، وە شەیتان بەهەر کەسێکی یاخی لە دین دەگوترێت، هەر بۆیەشە ئەو ناوەی لێندراوە چونکە دوورە لە ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە.

وە مەبەست لە شەیتانەکان: جنۆکە کافر و بێ باوەڕەکانن کە لە فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی خوای گەورە دەرچوون.

## ئیبلیـس :

ئیبلیس: یەکەم شەیتان و جنۆکەی بێ باوەڕە[١]، کەواتە جنۆکەیە نەك فریشتە بەڵگەشمان ئەو خاڵانەی خوارەوەن:

١- ئیبلیس لە ئاگر دروستکراوە[٢].

٢- ئیبلیس وەچە و نەوەی هەیە[٣].

---

(١) الكهف: ٥٠.

(٢) الأعراف: ١٢.

(٣) الكهف: ٥٠.

٣- ئیبلیس سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەی کرد کاتێك کڕنووشی (کڕنوشی ڕێزی) بۆ ئادەم نەبرد، بەڵام فریشتەکان پارێزراو و مەعسومن لەسەرپێچی کردن و تاوانکردن..

## هەڵوێستی شەیتانەکان لەبارەی مرۆڤەوە

شەیتان دوژمنی مرۆڤە، وەبەشێك لەشێوازی دوژمانەیەتیەکەیی و ئەو چەکانەی هێرشی پێدەکاتە سەر مرۆڤ ئەمانەن:

١- ڕازاندنەوە و جوانکردنی بێباوەڕی و لە سنوور دەرچوون و خراپەکاری[١].

٢- هەڕەشەی فەقیر بوون و فەرمانکردن بەخراپە[٢].

٣- دروستکردنی دوژمنایەتی و وروژاندنی ڕقوکینە لەنێوان مرۆڤەکاندا[٣].

٤- گومان و وەسوەسە دروستکرن لە سینە و دڵی خەڵکدا[٤].

---

(١) النحل: ٣٦. والأنعام: ٤٣.

(٢) البقرة: ٢٦٨. والأعراف: ٢٧.

(٣) المائدة: ٩١. الإسراء: ٥٣.

(٤) المؤمنون: ٩٧ _ ٩٨. والناس.

## خۆپاراستن لە شەیتان

١. باوەڕبوون بەوەی کە شەیتان هیچ باڵادەستیەکی نیە بەسەر بەندە چاك و بۆ خوا سوڵحاوەکاندا. خوای گەورە هیچ توانا و هێزێکی نەداوە بە شەیتان بۆ زاڵبوون بەسەر کەسی باوەڕداری نیازپاك.

٢. بیروباوەڕ و عەقیدەیەکی ڕاست و دروست.

٣. دەستگرتن بە قورئان و تێگەیشتن لێی.

٤. زیکر. ٥موناجات. ٦. خەڵوەت. ٧. نزا. ٨. موحاسەبەکردنی نەفس. ٩. چاودرێری کردنی نەفس. ١٠. ملنەدان بۆ نەفس. ١١. هاوڕێی باش. ١٢. پەروەردەی باش و جوان. ١٣. مەرجدانان لەسەر خۆت بەوەی کە ئەم چاکەیە بکەم و ئەو خراپەیە نەکەم. ١٤. بەگەورەدانانی سنوورەکانی خودا. ١٥. بیرکردنەوە لە مردن. ١٦. بیرکردنەوە لە کەمی دونیا. ١٥. جۆراوجۆری لە عیبادەت و پەرستشدا. ١٦مەجلیسی زیکر و فیکر.

# پەرتووکە ئاسمانیەکان

یەکێکی دیکە لە بنەماکانی ئیمان و بیروباوەڕی ئیسلامی بریتییە لە باوەڕبوون بە پەرتووکە ئاسمانیەکان.

کتێبە ئاسمانیەکان: بریتین لەو کتێبانەی کە خوای گەورە دایبەزاندوون و ناردوونی بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام) بۆ ئەوەی بە خەڵکی ڕابگەیەنن، ناوەڕۆکی ئەو کتێبانە بانگەوازی بۆ خوابەیەك زانین و بەتەنها پەرستنی خوا و باوەڕهینان بە ڕۆژی دوایی و هاندان بۆ کاری خێر لە خۆدەگرێ.

پوختەی باوەڕوەڕهێنان بە پەرتووکەکانی خودا بریتییە لە: باوەڕبوونی تەواو بەوەی کە خوای گەورە چەندین پەرتووکی ناردووە بۆ پێغەمبەران کە هیدایەتی بەندەکان و چاکەی دونیا و قیامەتیانی تێدایە، وە ئەو پەرتووکانە وەحی خوای گەورەن و حەق و ڕاستن لەلایەن خوای گەورەوە هاتوون.

## قورئانی پیرۆز هەندێك لەو کتێبانەی باسکردووە

١- سوحوفی ئیبراهیم و موسا (سەلامی خوایان لێبێت): کە بۆ ئیبراهیم و موسا دابەزیوە.

٢- تەوڕات: کە بۆ موسا دابەزیوە (سەلامی خوای لێبێت).

٣- زەبور: کە بۆ داود دابەزیوە (سەلامی خوای لێبێت).

٤- ئینجیل: کە بۆ عیسا دابەزیوە (سەلامی خوای لێبێت).

٥- قورئان: کە بۆ محمد (سەلامی خوای لێبێت) دابەزیووە، لە هەموو کتێبەکان گەورەترە بەبێ هیچ گومانێك، هەروەها کۆتا کتێبە و نێردراوە بۆ کۆتا پێغەمبەر (صلى الله علیەوسلم).

## واجب و پێویستە باوەڕ بە کتێبە ئاسمانیەکان بهێنین

پێویستە باوەڕبهێنین بەوەی کە ئەو کتێبانە وتەی خوای پەروەردگان و وەحی و نیگان لەلای خواوە نێردراون بۆ ئەو پێغەمبەرانەی کە باسمانکردن، لەهەمان کاتدا پێویستە و واجبە کە بە گشتی باوەڕمان وابێت کە خوای گەورە کتێبی تریشی ڕەوانەکردووە و ناردووە بۆ پێغەمبەرانی تر کە ناویان نازانین، ئەوانیش حەق و ڕاستن، چونکە لە لای خواوە نێردراون.

## شوێنەوار و کاریگەری باوەڕ بە کتێبە ئاسانیەکان

١- تـــەواوی و بێکەم و کوڕی و کارزانی خـــوای گەورەت بۆ دەردەکەوێت:

باوەڕبوون بە کتێبە ئاسانیەکان واتە بە ڕاستدانانی وەحی و نیگای خوای پەروەردگار، وە باوەڕهێنانە بەوەی کارزانی و حیکمەتی خوای گەورە تەواو و بێکەم و کوڕییە، وە بەندەکانی هەروا وێڵ ناکات بەبێ ئەوەی ڕێگای هیدایەت و ڕاستی، وە

ئەرك و ماف، وە ئەوەی سوود و زیانی دونیا و دوا ڕۆژیانی تێدایە بۆ ڕوون بکاتەوە.

٢- بەڵگەیە بۆ یەکبوونی پەیامە ئاسمانیەکان:

باوەڕبوون بە کتێبەکانی خوای گەورە باوەڕبوونە بە پێغەمبەرانی، ئەوەش ئەو ئاماژەیەی تێدایە کە پەیامەکانی خوای گەورە یەکن و کۆکەرەوەی باوەڕدارانن، وە ئەو کتێبانە هەموویان لەلایەن زاتێکەوە نێردراوە ئەویش خوای تاك و تەنهایە، وە یەك ئامانجیان هەیە ئەویش بانگەوازیکردنە بۆ خوابەیەك دانان لەپەرستن و باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی و کردنی کاری چاك.

١- بەدەستهاتنی هیدایەت و ڕەحمەت.

٢- ئارامی ڕووح و عەقڵ و جەستە.

# قورئـــان

**قورئـــان:** سەرگوزەشتەی ئەزەلیی پەرتووکی مەزنی گەردوون و تەرجومانی ئەبەدیی ئەو زمانە جۆراوجۆرانەی بوونەوەرانە کە ئایەتە تەکوینییەکان دەخوێننەوە و موفەسسیری پەرتووکی هەردوو جیهانی پەنهان و ئاشکرایە، دەرخەر و پیشاندەری گەنجینە مەعنەوی و پەنهانەکانی ئەو ناوانەی خوداوەندە کە لە توێی لاپەڕەکانی ئاسمانەکان و زەوی دا شارراونەتەوە. کلیلێکە بۆ کردنەوەی ڕاستییەکانی ئەو کاروبارانەی کە لەناو دێڕەکانی ڕووداوەکاندا حەشار دراون. زمانی جیهانی پەنهان (غیب) ە لە جیهانی بینراو(شهادة)دا. گەنجینەی گفتوگۆی ئەزەلییە پاك و بێگەرد. ئاوڕدانەوە ئەبەدییەکانی خودای میهرەبانە کە لە جیهانی پەنهانی پشت پەردەی ئەم جیهانە بینراوەوە هاتووە. خۆر و بناغە و نەخشە و ئەندازەی جیهانی مەعنەویی ئیسلامە. نەخشەیەکی خاوێن و موقەدەسی جیهانەکانی ئەو دنیایە و تەفسیری ئاشکرا و بەڵگەی مەحکەم و تەرجومانی ڕووناکی زات و سیفات و کاروبار و ناوەکانی خوداوەندە. پەروەردەکار (مُربيّ)ی ئەم جیهانی مرۆڤایەتییە. بە وێنەی «ئاو» و «ڕووناکی»ش وایە بۆ مرۆڤایەتیی مەزن کە ئیسلامەتییە. دانایی ڕاستەقینەیە بۆ ڕەگەزی مرۆڤ. ڕێ پیشاندەری گرۆی ئادەمیزادیشە بۆ لای ئەو شتانەی کە بەختەوەرییان تێدایە.

هەروەك بۆ مرۆڤ پەرتووكی شەریعەتە، پەرتووكی زانستیشە، هەروەك پەرتووكی دوعا و بەندایەتییە، پەرتووكی فەرمان و بانگەوازیشە، هەروەك پەرتووكی زیكرە، پەرتووكی فیكریشە، تاقانە پەرتووكی موقەددەسی پیرۆزە كە هەموو ئەو پەرتووكانەی تێدا جەم بووبێت كە پێداویستییە مەعنەوییەكانی قورئان: سەرگوزەشتەی ئەزەلیی پەرتووكی مەزنی گەردوون و تەرجومانی ئەبەدیی ئەو زمانە جۆراوجۆرانەی بوونەوەرانە كە ئایەتە تەكوینی یەكان دەخوێننەوە. موفەسسیری پەرتووكی هەردوو جیهانی پەنهان و ئاشكرایە، دەرخەر و پیشاندەری گەنجینە مەعنەوی و پەنهانەكانی ئەو ناوانەی خوداوەندە كە لە توێی لاپەڕەكانی ئاسمانەكان و زەوی دا شارراونەتەوە، كلیلێكە بۆ كردنەوەی ڕاستییەكانی ئەو كاروبارانەی كە لە ناوەند دێڕەكانی ڕووداوەكاندا حەشار دراون، زمانی جیهانی پەنهان (غیب)ە لە جیهانی بینراو (شهادة)، گەنجینەی گفتوگۆ ئەزەلییە پاك و بێگەرد، ئاوڕدانەوە ئەبەدییەكانی خودای میهرەبانە كە لە جیهانی پەنهانی پشت پەردەی ئەم جیهانە بینراوەوە هاتووە، خۆر و بناغە و نەخشە و ئەندازەی جیهانی مەعنەویی ئیسلامە، نەخشەیەكی خاوێن و موقەددەسی جیهانەكانی ئەو دنیایە و تەفسیری ئاشكرا و بەڵگەی مەحكەم و تەرجومانی ڕووناكی زات و سیفات و كاروبار و ناوەكانی خوداوەندە پەروەردەكار (مُربيّ)ی ئەم جیهانی مرۆڤایەتییە و.. بە وێنەی «ئاو»و« ڕووناكی»ش وایە بۆ مرۆڤایەتیی مەزن كە ئیسلامەتی یە و..

دانایی ڕاستەقینەیە بۆ ڕەگەزی مرۆڤ و.. ڕێ پیشاندەری گرۆی ئادەمیزادیشە بۆ لای ئەو شتانەی کە بەختەوەری یان تێدایە و.. هەروەك بۆ مرۆڤ پەرتووکی شەریعەتە، پەرتووکی دانستیشە.. هەروەك پەرتووکی دوعا و بەندایەتی یە، پەرتووکی فەرمان و بانگەوازیشە.. هەروەك پەرتووکی زیکرە، پەرتووکی فیکریشە و.. تاقانە پەرتووکی موقەدەسی پیرۆزە کە هەموو ئەو پەرتووکانەی تێدا جەم بووبێت کە پێداویستیە مەعنەوی یەکانی مرۆڤ دەهێننەدی. تەنانەت ئەم قورئانە بۆ مەشرەبی هەریەکە لە ئەهلی مەشرەبە جۆراو جۆرەکان و ڕێبازی هەموو یەکێ لە خاوەن ڕێبازە جیا جیاکانی: ئەولیا و صیددیقان و خوداناسان و زانا لێکۆڵەرەکان، بۆ هەریەك لەمانە، نامەیەکی پیشان داوە کە شیاوی چێژ و ڕووناك کردنەوەی مەشرەبەکەی ئەو بێت و لەگەڵ ڕوونکردنەوەو ڕێڕەوی ئەو ڕێبازەدا بگونجێت. کەواتە ئەم پەرتووکە ئاسمانییە دەڵێی پەرتووکخانەیەکی موقەددەسی پڕ لە پەرتووکە! دەهێننەدی. تەنانەت ئەم قورئانە بۆ مەشرەبی هەریەکە لە ئەهلی مەشرەبە جۆراو جۆرەکان و ڕێبازی هەموو یەکێ لە خاوەن ڕێبازە جیا جیاکانی: ئەولیا و صیددیقان و خوداناسان و زانا لێکۆڵەرەکان، بۆ هەریەك لەمانە، نامەیەکی پیشان داوە کە شیاوی چێژ و ڕووناك کردنەوەی مەشرەبەکەی ئەو بێت و لەگەڵ ڕوونکردنەوەو ڕێڕەوی ئەو ڕێبازەدا بگونجێت. کەواتە ئەم پەرتووکە ئاسمانی یە دەڵێی پەرتووکخانەیەکی موقەددەسی پڕ لە پەرتووکە! (م. سیعد نورسی، کلیات و مثنوي).

## نوسینەوەی قورئان:

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چەند نوسەرێکی وەحی هەبوون، کاتێك دەقێك یان چەند دەقێك دادەبەزی پێیدەگوتن: لەو سورەتە دایبنێن کە ئاوا و ئاوایە، واتە وەسفی بۆ دەکردن.

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد قورئان پارێزراو بوو لە سینەی هاوەڵان و کتێبەکاندا.

بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆخۆی هەڵنەستا بە کۆکردنەوەی قورئان لە یەك کتێبدا، لەبەر چەند هۆکارێك کە گرینگترینیان ئەوانەن:

١- کورتی ماوەی نێوان دابەزینی کۆتا دەق و گەڕانەوەی سەروەرمان (صلی الله علیه وسلم) بۆ لای پەروەردگار.

٢- بەردەوامی دابەزینی وەحی و نیگا، چونکە ڕیزبەندی دەقەکان بەپێی ڕیزبەندی دابەزینیان نیە، ئەوەتا هەندێك سورەت لە کۆتاییەکاندا دابەزین، بەڵام لە ڕیزبەندی قورئان لە بەشی پێشەوەیە، وەکو سورەتی بەقەڕە (البقرة)، وە هەندێك سورەت زوو دابەزیون، بەڵام لە ڕیزبەندی قورئاندا لە بەشی دواوەن، وەکو سورەتی ئیقرەء (اقرأ).

## کۆکردنەوەی قورئان لەلایەن ئەبوبەکرەوە:

کاتێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد و ئەبوبەکر جێگای گرتەوە، فەرمانی بە زەیدی کوڕی ثابت کرد

کە قورئان کۆبکاتەوە لە یەك بەرگدا، کە لەلای ئەبوبەکری دانا، پاشان هاتە لای عومەر لەدوای ئەو، پاشان هاتە لای حەفصەی دایکی باوەڕداران (ڕەزای خوایان لێبێت). هۆکاری سەرەکیش بۆ ئەو کۆکردنەوەیە بریتیبوو لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان و شەهیدبوونی زۆرێك لەو هاوەڵانەی کە هەموو قورئانیان لەبەر بوو، وە یەکەم کەس کە ئەو بیرۆکەیەی بۆ هات عومەری کوڕی خەتتاب بوو (ڕەزای خوای گەورەی لێبێت). کۆکرنەوەکە تەواوبوو بەر لەوەی دوو ساڵی تەواو تێپەڕ ببێت بەسەر کۆچی دوایی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم).

نوسینەوەی قورئانی پیرۆز لەسەردەمی پێشەوا عوسمان و لەبەرگرتنەوەی چەندین وێنە لێی:

کاتێك پێشەوا عوسمان خلافەتی گرتە دەست، لیژنەیەکی ڕاسپارد کە چەندین وێنەیان لە قورئان نوسیەوە و دابەشی کردن بەسەر ویلایەت و ناوچە و شارەکانی خلافەتی ئیسلام، بۆئەوەی ببێتە بنچینە و ئەسڵ بۆ قورئانخوێنان و نوسەرەکان و لەو وێنە و نوسخانە قورئان دابەشکرا بەسەر هەموو جیهان.

جیاوازی نێوان کۆکردنەوەی پێشەوا ئەبوبەکر و عوسمان (ڕەزای خوایان لێبێت):

چەند جیاوازیەك هەیە لەنێوان ئەو کۆکردنەوەی کە لەسەردەمی ئەبوبەکردا کرا لەگەڵ ئەو کۆکردنەوەیەی کە لەسەردەمی عوسماندا کرا، گرینگترینیان باس دەکەین:

ئەوەی پاڵی بە پێشەوا ئەبوبەکرەوە نا بۆ کۆکردنەوەی قورئان بریتیبوو لە ترسی لەدەستچوونی بەشێك لە قورئان، کاتێك زۆرێك لەو هاوەڵانە شەهیدبوون کە قورئانیان لەبەربوو لەشەڕی یەمامە، بەڵام پاڵنەری پێشەوا عوسمان بریتیبوو لە جیاوازی شێوازی خوێندنەوەی قورئان و ترس لەوەی کە قورئان بەشێوەیەك بخوێندرێتەوە کە لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەبیسترابێت.

٣- کۆکردنەوەی یەکەم بریتیبوو لە کۆکردنەوەی ئەو لاپەڕە و نوسراوانەی کە لەلای هاوەڵان بوون لە کتێبێکدا، ئەوەی دووەمیان لەبەرگرتنەوەی ئەوەی ئەبوبەکر بوو (ڕەزای خوایان لێبێت).

## جێگیرکردنی چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئان:

هەروەکو چۆن هاوەڵان نوسینەوەی قورئانیان پاراست و لە سینەشیاندا پاراستیان و لەنوێژەکانیاندا دەیانخوێندەوە، قورئان بەخوێندنەوە دابەزیوە، جیبریل نەقڵی کردووە و هێناویەتی لەلای خوای پەروەردگارەوە و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەوەندە پێداگر و سووربوو لەسەر لەبەرکردنی هەمیشە لەبەرخۆی دەیگوتەوە، پاشان مسوڵمان یەك لەدوای یەك کۆمەڵ لەدوای کۆمەڵ لە کتریان وەرگرتووە بەو شێوەیەی کە لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)یان بیستووە، لەدوای ئەوە قورئانخوێنان یاساکان و حوکمەکانی تەجویدیان لێهەڵێنجا

و دەرهێنا و لە زانستی خوێندنەوە و قیرائەت و تەجویددا تۆماریانکرد و نووسیانەوە، ئەو زانستە ناتوانرێ بەتەواوی و تۆکمەیی وەربگیردرێ بەوەرگرتنی ڕووبەڕوو نەبێت، بەشێوازی وتنی زارەکی.

مسوڵمانان ئەوڕۆ بەجیاوازی ڕەنگ و زمانیان قورئان بەیەك شێوە دەخوێنن، بەشێوەیەك ئەگەر قورئانخوێنێك لە ڕۆژهەڵاتی زەوی هەڵە بکات لەدەربڕینی پیتێك بەشێوەیەکی ڕاست، ئەوا لەلایەن بیسەرانیەوە بۆی ڕاستدەکرێتەوە لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی، وە بەوەش دەزانین کە قورئانی پیرۆز خوێندراوەتەوە و نوسراوەتەوە و پارێزراوە لەسەردەمی پێغەمبەر و هاوەڵاندا و تووشی ئەو گۆڕین و دەستکاری کرانە نەبووە کە لە کتێبە ئاسمانیەکانی پێش قورئان کراوە و بەدی دەکرێت[١].

### * تایبەتمەندییەکانی قورئان

**١.** پەرتووکێکی خوداییە و لەلایەن ئەوەوە نێردراوە.

**٢.** موعجیزە و دەساوەسانکەرە لە هەموو ڕووەکانەوە.

**٣.** پەرتووکێکی ئاسانە و تێگەیشتن لێی شتێکی مومکینە.

**٤.** پەرتووکێکە هەموو پایەکانی ئایینی تێدایە، کە بریتین لە: عەقیدە، شەریعە، تەزکیە و ڕەوشت.

---

(١) لب العقیدة الاسلامیة، ل ٦٠ – ٦٢.

٥. پەرتووکێکە پارێزراوە و هیچ پیت و وشەیەکی دەستکاری نەکراوە.

٦. پەرتووکێکە بۆ هەموو کاتەکان و بارودۆخەکان دەگونجێت.

٧. پەرتووکێکە بۆ هەموو شوێنێك دەگونجێت.

٨. پەرتووکێکە بۆ هەموو جیهان و مرۆڤایەتییە بە ڕەنگ و دەنگی جیاوازەوە.

٩. پەرتووکێکە بۆ تێرکردنی هەرسێ بەشەکەی مرۆڤ: عەقڵ و ڕووح و جەستەیە.

١٠. پەرتووکی هاوسەنگە لە نێوان تاك، کۆمەڵ، هەست، شعور، واقیع، عەقڵ، دڵ، دونیا و دوارۆژ.

١١. پەرتووکێکە تەفسیر و ڕاڤەی جیاجیا هەڵدەگرێت و دەکرێت بە چەندان شێوە لێکدانەوەی بۆ بکرێت، هەربۆیە هەرگیز کۆن نابێت.

١٢. پەرتووکێکە لە هەر زانستێك لێی بگەڕێی شتێکت لێی دەست دەکەوێت و ئاماژەی گەورە و وردی تێدایە لە هەموو بوارەکاندا.

١٣. هەرچەندە دەیخوێنی و گوێی بۆ دەگری لێی بێزار نابیت و تاکە پەرتووکێکە ئەوەندە بخوێنرێتەوە.

١٤. گوێگرتن و خوێندوەکەی بەرەکەتدارە و شیفاهێنە هەم بۆ دڵ و ڕووح و نەفسەکان، هەم بۆ جەستە و لاشەکان.

١٥. تاکە پەرتووکە ئەوەندە زۆر لەبەرکراوە و لەبەردە کرێت.

١٦. پەرتووکێکە هەتاوەکوو لەگەڵیدا نەژیێیت ناتوانیت بە چاکی و بەپێی پێویست لێی بەهرەمەند ببی، هەر لێی دابڕێی لێت دادەبڕێت، زۆر زوو لەبەر دەکرێت، بەڵام زۆر زووش دەڕوات و لەبیرت نامێت ئەگەر زۆر و زوو لە خزمەتیدا نەبی.

### * مەبەستەکانی قورئان

لێرەدا وەك سەرەقەڵەمێك چەند مەبەستێك باس دەکەین و دواتر بەدرێژتر لەسەری دەدوێین:

١. دامەزراندن و ڕاستکردنەوەی عەقیدە و بیروباوەڕ و فکر و هزر.

٢. دامەزراندن و ڕاستکردنەوەی ڕەوشت و ئاڕاستەکردنی مرۆڤ بەرەو لوتکەی ڕەوشتیبوون.

٣. ڕێزگرتنی مرۆڤ و گێڕانەوەی ڕێز بۆی.

٤. چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤ.

٥. هاندان لەسەر گرێدانی دونیا و قیامەت بەیەکەوە.

٦. هاندان بەرەو عەقڵ و زانست و بیر و فکر و هزر.

٧. دروستکردنی هاوسەنگی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

٨. عیبادەت و پەرستش.

٩. تەزکیەی نەفس و پاککردنەوەی دڵ و دەروون.

١٠. دروستکردنی تاك و خێزان و کۆمەڵگە و سیاسەت و ئابووری و هتد کە جوان و باش و پاك و بەسوود بێت.

١١. ڕێزگرتن لە ئافرەت و گێڕانەوەی ماف بۆی.

١٢. هاندان بۆ جیهانێکی مرۆیی هاوکار و یەکگر بە هەموو ڕەنگ و دەنگە جیاوازەکانەوە.

١٣. دروستکردنی بیری مرۆڤ سەنتەربوون.

### * بابەتەکانی قورئان

**بەشێوەیەکی گشتی قورئان باسی حەوت شت دەکات:**

١. عەقیدە و بیروباوەڕ و فکر و فەلسەفە

٢. تەزکیە

٣. ڕەوشت و سلوك

٤. بەسەرهاتی پێشینان

٥. باسی گەردوون و مانگ و خۆر و...

٦. فیقهـ و ئەحکام بە عیبادات و موعامەلاتەوە

٧. هەواڵدان لە هەندێك شتی داهاتوو




### * ئەرکمان بەرانبەر بە قورئان

١. ئیمان پێ هێنانی

٢. ڕێزگرتن و بە گەورە دانانی

٣. تێگەیشتنی ڕاست و دروست و واقعیانە لێی

٤. بیرکردنەوە و تێڕامان لێی

٥. گوێڕایەڵی کردن لە ئەمر و نەهییەکانی

٦. عیبرەت وەرگرتن لە چیرۆك و بەسەرهاتەکانی

٧. گەیاندنی بە خەڵکی

٨. فێرکرنی خەڵکی بە خوێندنەوە و تێگەیشتن و بیرلێکردنەوەی قووڵ لێی

٩. خوێندوەی

١٠. گوێگرتن لێی

١١. لەبەرکردنی

### * چۆن سوود لە قورئان وەرگرین و لێی بەهرەمەند بین؟

١. فێربوونی زمـانی عـەرەبی، بە زانستەکانی ( نحـو، صرف، بلاغة)ەوە.

٢. خوێندنەوەی زۆربەی تەفسیرەکان بە قوتابخانە و ئاڕاستە جیاوازەکانەوە.

٣. نەبوونی تەعەسوب و دەمارگیری بۆ قوتابخانە یان ئاڕاستەیەکی دیاریکراو.

٤. دوورکەوتنەوە لە چەقبەستوویی و داخراویی و دەرگا داخستن بەسەر خوێندنەوەی نوێ و بەجێ.

## مەبەست و ئامانجەکانی قورئان

مەبەست و ئامانجەکانی قورئان (مقاصد القرآن): هەموو ئەو ئامانج و مەبەست و حیکمەتانەن کە قورئان دەیەوێت بیانهێنێتەدی لە میانەی دەقەکانی و کۆی بابەتەکانی، کە ئەوەندە فراوانە کۆ ناکرێتەوە و (حصر) ناکرێت.

هەندێ پێناسە بۆ مەبەست و ئامانجەکانی قورئان (مقاصد القرآن).

(الغايات اللتى أنزل القرآن لأجلها تحقيقا لمصالح العباد).

- معظم مقاصد القرآن الامر باكتساب المصالح وأسبابها، والزجر عن اكتساب المفاسد وأسبابها.

- هى المقاصد اللتى دارت عليها سور القرآن الكريم وآياته تعريفا برسالة الاسلام، وتحقيقا لمنهجه فى هداية البشر.

لەم سێ پێناسەیەوە دەردەکەوێت کە قورئانی پیرۆز بە سورەت و ئایەتەکانیەوە هاتووە بۆ ڕێنمایی مرۆڤ و بەختەوەر کردنی و

جێبەجێ کردنی بەرژەوەندیەکانی و لێدورخستنەوەی مەفسەدە و خراپەکان لە دونیا و دوا ڕۆژ، کەواتە مەقاصیدی قورئانیش هەر ئەو ئامانجانەن کە لە پێناسەی مەقاصیدی شەریعە دا هاتووە، بەڵام دەبێ بزانین مەقاسیدی قورئان فروانترە لە مەقاسدی شەریعە، وە بێ چەند و چونە، سەرچاوەکەشی بێ گرفتە، بەڵام کە باسی شەریعە بکەین سەرچاوەکانی تریش دێنە ناو، کە ڕوونە زانایان لەسەر هەموویان کۆك نین.

## مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی قورئان

مەبەست و ئامانجەکانی قورئان یەکجار زۆرن بەڵام ئێمە لێرەدا چەند دانەیەکی گرینگ باس دەکەین:

**١.** معرفة الله وعبادته وتوحيده: ناسین و پەرستشی خوای گەورە، گەورەترین ئامانجی قورئان ئەوەیە کە ئێمە خاوەنی خۆمان بناسین، بیپەرستین، ڕەزامەندی ئەو بەدەست بێنین، خۆشمان بوێت، لێی بترسین، بزانین مافی چییە بەسەرمانەوە، ئەرکمان چییە بەرامبەری، بەکام ڕێگایە پێی بگەین، چ کەسێك بە ئەومان شاد دەکات، چۆن بۆی بژین، چۆن لەدەستی نەدەین، چۆن تامەزرۆی لیقای بین، چۆن بەختەوەریمان لەناسینیدا بدۆزینەوە؟... {وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ}.[١]

**٢.** تزكية النفس وتربيته: پاککردنەوەی نەفس و دڵ و دەروون، دووەم ئامانجی قورئان پەروەردەکردنی مرۆڤە، ئەوەیە کە ئەم

---

(١) (الذاريات: ٥٦).

مرۆڤە پێگە و پایەی خۆی بزانێت، ئەرکی خۆی بزانێت، چۆن ببێتە ڕەحمەت بۆ دروست کراوەکانی تر، نەبێتە زەحمەت و مەینەت و ئازار، چۆن دەوری خۆی ببینێت، چونکە ئەگەر مرۆڤ پەروەردەکراو بێت ژیان خۆش و ئارام دەبێ، ستەم و بێدادی نابێت، مرۆڤەکان تام لە بوونیان دەکەن، تەمەنнای مردن ناکەن وەك ئەمڕۆ کە دەبینین و دەبیستین، {قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا}.[1]

٣. تعمیر الارض: ئاوەدان کردنەوەی زەوی و خۆش کردنی ژیان و ژینگە. {هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ}.[2]

٤. مقصد ابتلاء الانسان: ئامانجی تاقی کردنەوەی مرۆڤ، بەداخەوە زۆر کەس بە هەڵە لەمە تێدەگات، بەڵام بەڕاستی تاقی کردنەوەی مرۆڤ و دەرفەت پێدان و ئازادی پێدانی گەورەترین ڕێزە بۆ مرؤڤ، چۆن؟ چونکە هەموو مرۆڤایەتی تاقیکردنەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان بەشانازی دەزانێت، ئەگەر کەسێك بێ تاقیکردنەوە پلەیەك، پۆستێك، شەهادەیەك، بەدەست بێنێت خەڵك متمانەی پێ ناکەن و گاڵتەی پێ دەکەن، تاقیکردنەوەکە لە توانای مرۆڤ دایە، پرسیارەکان بە هەموو کەس وەڵام دەدرێنەوە، ئەوەی کە ژیری هەبێت و (مكلف) بێت، پرسیارەکان: خوات کێیە؟ پیغەمبەرت کێیە؟ دینت چییە؟ لەسەر ئەم زەوییە پرسیاری ئەوا ئاسان نییە، بەمەرجێ پرسیارەکان وەڵام دراونەوە،

---

(١) (الشمس: ٩).

(٢) (هود: ٦١).

بەس بیان پارێزە، هەموو ئەو کەسانەش کە دەرفەتی پێگەیشتن و تێگەیشتنی ئەو پرسیارانەی نەبوو خوای گەورە سزای نادات. { وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا }(الإسراء: ١٥)، بەڵگەکانی ئامانجی تاقیکردنەوە زۆرن لەوانە: { ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ }.[١]

**٥.** مقصد تحقيق العدالة: ئامانجی پیادەکردنی دادگەری لە هەموو بوارەکان یەکێکە لە ئامانج و مەبادیئە بنچینەییەکان. { لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ }.[٢]

**٦.** مقصد كرامة ا لإنسان: هێنانە دی ڕێز بۆ مرۆڤ، ئەم کەرامەتە بۆ هەموو مرۆڤێکە، { وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا }.[٣]

**٧.** مقصد التعارف في جعل الناس شعوبا وقبائل مختلفا: یەکترناسینی هەموو مرۆڤەکان و مرۆڤایەتی، {يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ}.[٤]

---

(١) (الملك: ٢).

(٢) (الحديد: ٢٥).

(٣) (الإسراء: ٧٠).

(٤) (الحجرات: ١٣).

**٨. مقصد التعاون بين الناس وإن كانوا مختلفين في العقائد والمصالح:** یارمەتیدانی یەکتری با جیاوازیش بین لە یەکتری لە بیرکرنەوە و ئایین و بیروباوەڕ و.... {وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ}.[١] مرۆڤەکان ناتوانن بەبێ یەك بژین، وە پێویستییان بەیەك دەبێت، با لە بیروباوەڕ و بیروڕاش جیاواز بن.

**٩. مقصد الحرية:** هێنانەدی ئازادی، ئازادی چ لە بیروباوەڕ بێت یان لە بیروڕا بێ، شەریعەت هاتووە دابینی بکا، بوونی مرۆڤ بە بیروباوەڕیەتی، ئەگەر نەتوانێ مومارەسەی بیروڕا و بیروباوەڕی بکات، بوونی هیچ واتایەکی نییە.[٢]

ئەم ئایەتە پیرۆزە و ئایەتەکانی پێشتر بێ پێچ و پەنا باسی ئازادی بیروباوەڕ دەکەن، وە یەکێك لە ئامانجەکانی ئیسلام بەرگری کردنە لە پیرۆزییەکانی خەڵك جا شوێنی جولەکە بێت وەك (بيع)، یان مەسیحیەکان (صوامع)، یان هی مسوڵمانەکان بێ وەك (مسجد)، یان هی هەموو دینەکان بێ وەك (صلوات)، هەرچەند موفەسیرەکان ڕاڤەی جۆراوجۆریان بۆ ئەم وشەیە کردووە، بەڵام من پێم وایە باشترین ڕاڤە ئەوەیە کە مەبەست لە پیرۆزییەکانی دینەکانی هەموو دونیا بێت نەوەك دینێك بە تەنیا، چونکە هەرکەس دینی هەبوو هەر دینە با ڕاستیش نەبێت،

---

(١) (المائدة: ٢).

(٢) (الحج: ٤٠).

مادام بەلایەوە پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێ، { لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ}.(١)

**١٠. مقصد حفظ الدين:** پاراستنی ئایین، دیارە ئەوەیان جیاوازە لە خاڵەکەی پێشتر، ئەوەی پێشتر بۆ ئازادییە، بەڵام ئەوەیان بۆ پاراستنە، پاراستن بە دوو شێوە دەبێت، شێوەی یەکەم، بۆ دامەزراندن و بڵاوکردنەوە و ڕوونکردنەوەی، شێوەی دووەم، بە بەرگری لێکردن و پاراستنیەتی، {وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ}.(٢)

**١١. مقصد حفظ النفس:** پاراستنی گیانی مرۆڤ، جا هەر بیروباوەڕێکی هەبێت لە ئامانجە گەورەکانی قورئانە، بۆیە خوای گەورە سزای قورسی داناوە بۆ ئەو کەسانەی دەستدرێژی دەکەنە سەرگیانی مرۆڤ یان ئەندامێکی یان مافێکی.(٣) (٤)

**١٢. مقصد حفظ العقل:** پاراستنی ژیری مرۆڤ یەکێك لە ئامانجە گەورەکانی ئیسلام و قورئانە، چونکە مرۆڤ بەهۆی ژیرییەکەی بەرپرسیارە لە دونیا و دوارِۆژ، بۆیە هەرشتێك زیان بە ژیری مرۆڤ بگەیەنێت شەریعەت قەدەغەی کردووە، وەك مەی

---

(١) (الكافرون: ٦).

(٢) (البقرة: ١٩٣).

(٣) (البقرة: ١٧٩).

(٤) (الإسراء: ٣٣).

خواردنەوە، تلیاك، حەشیش، هەموو ئەو دەرمانانەی بێ پێویستی مرۆڤ بەکاریان دەهێنێت.[١]

**١٣. مقصد حفظ المال:** پاراستنی ماڵ و سەروەت و سامان، ژیان بە ماڵەوە بەردەوامە و ڕاوەستاوە و پێش دەکەوێت.[٢] [٣]

**١٤. مقصد حفظ النسل:** پاراستنی وەچەی مرۆڤ لە ئامانجەکانی قورئان و ئیسلام و شەریعەتە، بۆ ئەوەی جۆری ئینسانی بە شێوەی تەندروست بمێنێتەوە خوای گەورە هەموو جۆرەکانی لادانی جنسی قەدەغە کردووە، خوای گەورە زینای حەرام کردوە و سزای بۆ داناوە کە جەڵدە لێدانە. وە هەتا بوختان کردنی قەدەغە کردووە و سزای بۆ داناوە.[٤][٥] [٦] [٧] [٨]

**١٥. مقصد الهداية:** یەکێك لە ئامانجە پیرۆز و سەرەکیەکانی قورئان هیدایەتە.[٩]

---

(١) (المائدة: ٩١).

(٢) (النساء: ٥).

(٣) (المائدة: ٣٨).

(٤) (النور: ٢).

(٥) (النور: ٣).

(٦) (النور: ٢٦).

(٧) (النور: ٣٢)

(٨) (الإسراء: ٣٢).

(٩) (الإسراء: ٩)

**١٦. مقصد الشفاء:** یەکێ لە وەسفی قورئان ئەوەیە کە شیفا و چارەسەرە بۆ ڕووح و بۆ لاشە، بەڕاستی قورئان شیفایە بۆ نەخۆشی بیروباوەڕ، دەردی بەدڕەوشتی، کۆمەڵایەتی، خێزانی، تاکی.[١].

**١٧. مقصد الرحمة والتراحم:** ڕەحم و سۆز و بەزەیی و بەزەیی هاتنەوە بە یەکتری، قورئان وەسفێکی ئەوەیە کە ڕەحمەتە بۆ تاك و کۆمەڵگە و...، وە دەیەوێت ئەم ڕەحمەتە ڕەنگ بداتەوە لە دەیان دەقدا.[٢]

**١٨. مقصد إقامة الحجة على الإنس والجان:** عوزر نەهێشتن بۆ مرۆڤ و جنۆکەکان، قورئان هاتووە بۆ ئەوەی ڕێنمایی بێت بۆ مرۆڤایەتی و بەرچاو ڕوونییان بکات لە هەموو پێداویستییەکانی ژیان بۆ دین و دونیا، بۆ دونیا و دوا ڕۆژ.[٣]

**١٩. مقصد تعلیم وتعلم الجدال باللتی هی أحسن:** گفتوگۆ فێرکردن بە جوانترین شێوە، لەوانەیە هەندێ کەس ئینکاری ئەو ئامانجە بکات، بەڵام بەراستی زۆر ئامانجێکی گەورەیە، چونکە گەورەترین جۆری هیدایەت لەڕێی بەیان و گفتوگۆوە دەبێت.[٤]

---

(١) (الإسراء: ٨٢).

(٢) (یونس: ٥٧).

(٣) (النساء: ١٦٥).

(٤) (النحل: ١٢٥).

**٢٠. مقصد الانصاف مع الموافق والمخالف:** ئینساف بوون لەگەڵ هەموو خەڵك، قوڕئان زۆر پێداگری دەكات لەسەر دادگەری و ئینساف هەتا لەگەڵ ناحەزەكانیش.(١)

**٢١. مقصد تحقیق الاعجاز:** چەسپاندن و هێنانی ئیعجاز، چونكە هەركات ئیعجازی قوڕئان ئیسپات كراو سەلمێنرا ئەوە بەرامبەر یان دانی پێدا دێنێ، یان بێ دەنگ دەبێت و ناتوانێت قسە بكات، بۆیە دەبێ كار بكرێ لەسەر ئەم ئامانجە گەورەیە، قوڕئانی پیرۆزیش چەندین جار ئەم ڕاستییەی دووپات كردۆتەوە.(٢)

**٢٢. مقصد الفقه والفهم:** تێگەیشتن، ئەم قوڕئانە بۆیە هاتووە تا ئێمە لە شتەكان تێبگەین بەوردی، بۆیە پێویست دەكات خەڵكانێك تایبەت بكەین و هاوكاریان بین لە تێگەیشتنی ورد لە قوڕئان.(٣) (٤)

**٢٣. مقصد إحقاق الحق وإبطال الباطل:** چەسپاندنی حەق و پوچەڵكردنەوەی باتڵ و شتی پووچ، خوای گەورە ڕووداوگەلێك دێنێتە پێش بۆ ئەو ئامانجە چ لەسەر ئاستی تاك چ لەسەر ئاستی كۆمەڵگە، یان لەنێوان دوو گروپی ناكۆك و دژ بەیەك.(٥)

---

(١) (سبأ: ٢٥).

(٢) (الإسراء: ٨٨).

(٣) (التوبة: ١٢٢).

(٤) (الأنبياء: ٧٨).

(٥) (الأنفال: ٨).

**٢٤. مقصد إزالة الشبهات: ڕەواندنەوەی گومانەکان، قوڕئانی پیرۆز بەشێوەیەکی گشتی کار لەسەر دوو تەوەرە دەکا، یەك: سەلماندن و چەسپاندنی حەق. دوو: پووکاندنەوە و پوچەڵ کردنەوەی ناحەق.**

بۆیە زۆر بەرچاومان دەکەوێت کە خوای گەورەی گومانەکان پوچەڵ دەکاتەوە، یان لەڕێی پێغەمبەرەکانییەوە، یان لەسەر زمانی پیاو دانا و زاناکانەوە.[١]

**٢٥. مقصد إثبات العقيدة بإيراد الحجج وإزالة الشبه: چەسپاندنی عەقیدە بەهێنانەوەی بەڵگە و ڕەواندنەوەی گومانەکان، بیروباوەڕ لە هەموو شتێك گرنگترە، وە بەردی بناغەی شەریعەت و پابەندییە، بۆیە قوڕئان پریەتی لە گفتووگۆی عەقیدە و بیروباوەڕ، بۆنموونە باسی ئیسپاتی ڕبوبیەت و ئولوهیەت بەچەندین شێوە بەڵگە دێنێتەوە.[٢]**

**٢٦. مقصد التجاوب مع الفطرة السليمة: گەڕانەوە و هەماهەنگی بۆ فیترەت و سروشتی ساغ و سەلیم، قوڕئان ئامانجی ئەوەیە مرۆڤ بگێڕێتەوە بۆسەر فیترەت و سروشت پاکی خۆی، چونکە دینەکەی موافیقی ئەم سروشتەیە.[٣]**

---

(١) (الرعد: ١٦).

(٢) (النمل: ٦٤).

(٣) (الروم: ٣٠).

**٢٧. مقصد تعليل الاحكام والاحداث:** گەڕان بە دوای حیکمەت و فەلسەفە و هۆکاری ئەحکامەکان و ڕووداوەکان، قورئان زۆر هانمان دەدات بۆ ئەوەی حیکمەتی شتەکان بزانین و پشتی ڕووداوەکان بخوێنینەوە، هەم بۆ ئەوەی بزانین بۆ ڕویدا؟ هەم بۆئەوەی بزانین سەرنجامەکەی چی بوو، هەم بۆ چارەسەرکردن و دەستخستنە سەر برین، بۆ حوکمەکانیش هەر ڕاستە، هیچ حوکمێك نییە لە قورئانی پیرۆزدا یان بە وردی یان بەگشتی حیکمەت و فەلسەفەی دیار نەبێت، جا بەندایەتی بێ، یان ئەخلاق، یان عەقیدە و تەشریع یان ڕووداو.

**٢٨. مقصد تجاوز الزمان والمكان والاشخاص في سرد القصص والأمثال:** تێپەڕاندنی کات و شوێن و کەسەکان لە هێنان و گێڕانەوەی ڕووداو و چیرۆکەکان، گرنگە لەوە تێبگەین سەربردە و ڕوداوەکان تەنیا مێژوویەکی ڕووت و تایبەت بەکات و شوین و خەڵکانێك نین کە بووە، بەڵکو بۆ ئەوەیە هەمیشە ئەم شتانە زیندوو بمێنن و بیانکەین بە پێوەر و مەحەك بۆ ڕووداوەکان. فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ.[١]

**٢٩. مقصد التوازن في العمل والمواقف:** هاوسەنگ بوون لە کاروکردەوە و هەڵوێستدا، هاوسەنگی زۆر گرنگە، هەتا لەبەخشینیشدا هەر پێویستە.[٢]

---

(١) (الحشر: ٢).

(٢) (الرحمن: ٧).

**٣٠.** مقصد تقرير حقوق الانسان: چەسپاندن و پێدانی مافەکانی مرۆڤ، لەو خاوەن مافانە: مافی باب و دایك، مافی خێزان، مافی مێرد، مافی هاوبەشی هەردووکیان، مافی منداڵ، مافی بەساڵاچوان، مافی نەخۆشەکان، کەم ئەندامان، مافی کرێکار، مافی ژێردەستەکان، مافی پەنابەر، مافی ڕێبوار، مافی گیراو و ئەسیر، مافی زیندانی، مافی گەورەی وەڵات، مافی هاوڕێ، مافی جیران، مافی غەیرە مسوڵمان، مافی تۆمەتبار، مافی تاوانبار، مافی مردوو، مافی ئەوانەی نەخۆشی دەروونییان هەیە، مافی بێوەژنەکان، مافی قەیرەکان، مافی سەفیر و نوێنەرەکان، مافی کارمەند. جا ئەو مافانە هەموو جۆرە مافەکان دەگرێتەوە.

**٣١.** مقصد حق الدفاع: مافی بەرگری لەخۆکردن، قورئان لە چەندین دەقدا ئەم مافەی باس کردووە و یەکێکە لە ئامانجەکان.[١][٢]

**٣٢.** مقصد تقرير مصير الشعوب: مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان، گەلێك مادام خوای گەورە دروستی کردووە، مافی ئەوەشی هەیە کە سەرەوەری، وڵات، ماف، ئاڵا، سیادەی هەبێ.[٣]

**٣٣.** مقصد تحقيق الأمن: دابینکردنی ئەمن و ئارامی و ئاسایش، ئەمن و ئاساییش یەکێکە لە نیعمەتە گەورەکان نەوەك بۆ ئینسان بەڵکو بۆ زیندەوەران بە گشتی، بەڵکو بۆ ژیان و ژینگشە.[٤]

---

(١) (النساء: ٧٥).

(٢) (البقرة: ١٩٤).

(٣) (الحجرات: ١٣).

(٤) (قريش: ٤).

**٣٤. مقصد التعلم والتعليم:** فێربوون و فێرکردن، قورئانی پیرۆز لە یەکەم ئایەتێك کە دابەزیوە باسی خویندنەوە و خوێندەواری کردووە.[١]

**٣٥. مقصد أكل الحلال والطيبات:** خواردنی حەڵاڵ و پاك، پێکهاتەی لاشەی مرۆڤ ئەو شتانەیە کە دەیخوا بۆیە پێویستە مرۆڤ شتی پاك و خاوێن بخوات.[٢]

**٣٦. مقصد تكوين الاسرة:** دروستکردنی خێزان.[٣]

زەواج چەندین ئامانجی گەورەی تێدا لەوانە: بەجێهێنانی فەرمانی خوا، سوننەتی پێغەمبەرانە، تەواو بوونی دینداری، فراوانبونی بازنەی بەرپرسیاریەتی، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بەردەوامبوونی جۆری مرۆڤ بەشێوە هەرە جوانەکەی، دەرگای ڕزق و ڕۆزی، ئارامی، خۆشەویستی، بەزەیی و میهرەبانی، تەندروستی، کەمکردنەوەی تاوان، بەتایبەت تاوانە جنسیەکان، دیاربوونی نەسەب و کەسوکار و بنەماڵە، پارێزران لە نەخۆشییە جنسییەکان، هەروەها نەبوونی جێگرەوەی ڕاستەقینە بۆ زواج.

**٣٧. مقصد إنصاف المرأة:** ئینساف بوون لەگەڵ ئافرەت، پێش کەوتنی هەر کۆمەڵگەیەك بە ئافرەت پێوانە دەکرێت، هەر

---

(١) (العلق: ١).

(٢)

(٣) (النور: ٣٢).

کۆمەڵگەیەك ڕێزی ئافرەتی گرت و مافی پێدا و لەشوێنی شایەنی خۆی دانا پێشکەوتووە، ئەگینا بە بانگەشە و قسەی گەورە گەورەنیە.(١)

**٣٨.** **مقصد تحصين الأسرة:** پاراستنی خێزان، ئەوەی پێشوتر باسی دروستکردنی خێزان بوو، بەڵام ئەم ئامانجە باسی پاراستنییەتی، شەریعەت یاسا و ڕیسای زۆری داناوە بۆ پاراستنی خێزان، وە لەکاتی پێویستدا سزاشی داناوە، لە شەریعەت دا بەدرێژی باسی مافی ژن، مافی پیاو، مافی مناڵ، مافی باوك و دایك و خزمان و ئادابی چونە ماڵان و تێکەڵاو بوون و باسی مەحرەم و بێگانە و هەتا ئەدەبی هەڵسوکەوتی مناڵیش باسکراوە.

**٣٩.** **مقصد التربية:** پەروەردە، پەروەردەی مرۆڤ یەکێکە لە ئامانجە گەورەکان کە لەسەرەتادا ئاماژەمان پێدا، بەڵام مەبەستمانە لێرەدا ڕوونتر ناوی جۆری پەروەردەکان بێنین، بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕوون بێ و کاری لەسەر بکەین، لەوانە: پەروەردەی ئیمانی، پەروەردەی بەندایەتی، پەروەردەی ئەخلاقی، پەروەردەی کۆمەڵایەتی، پەروەردەی ژیریی، پەروەردەی تەندروستی وەرزشی، پەروەردەی دەروونی، پەروەردەی بەسزا، پەروەردە بە ئامۆژگاری، پەروەردە بەهاندان، پەروەردە بەدیاری پێدان، پەروەدە بەگێرانەوەی چیرۆك، پەروەردە بە کردەوە، پەروەردە بەهۆی هاوڕێ و شوێنی باش، پەروەدە بە خۆشویستن،

---

(١) (آل عمران: ١٩٥).

پەروەردە لەڕێی مامۆستای باش، پەروەردە لەڕێی گەشەکردنی مرۆیی، پەروەردەی زاستی، پەروەردەی میدیایی

بەڕاستی دەکرێت بواری پەروەردە زۆر فراوان بکرێت و گرنگی زیاتری پێ بدرێت، ئەوەی کە باس کرا بەس بۆ بەرچاو ڕوونییە، لەم بوارەوە شتی زۆر جوان و بەسوود نوسراوە، وە بەردەوام خول و سیمینار هەیە لەم بوارانەدا.

**٤٠.** مقصد حوار الأديان: گفتوگۆی ئایینەکان، ئەم بابەتە جیاوازە لە ئازادی بیروباوەڕ، مەبەست لێرەدا ئەوەیە گفتوگۆمان هەبێت لەگەڵ دینە جیاوازەکاندا، چونکە قورئان باسی دینەکانی تریشی کردووە و ڕەخنەی لێگرتوون و تەحەددای کردوون و پرسیاری لێکردوون و وەڵامی پرسیاری ئەوانیشی داوەتەوە لە: جولەکە، مەسیحی، مەجوسی، موشریك، دەهری، مولحید، صابیئە، وەچەندین بیروباوەری تر...

**٤١.** مقصد تكوين الامة الشهيدة: دروستکردنی ئوممەتی شایەتیدەر، {وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا }.(١)

ئوممەت نابێتە چاوەدێر بەبێ ئەوەی ئیسلام جێبەجێبکات.

**٤٢.** مقصد تكوين خير الامة: دروستکردنی باشترین ئوممەت، لەکاتێکدا ئەم ئوممەتە چاکترین ئوممەت بوو بە شاهێدی

---

(١) (البقرة: ١٤٣).

نەیارەکانیشیەوە، ئەو کاتانە بوو فەرمانی بەچاکە دەکرد، نەهی لە خراپە دەکرد، ئیمانی راستەقینەی بە خوا بە دوارۆژ هەبوو.[١]

**٤٣.** مقصد تكوين الامة الواحدة: دروستکردنی ئوممەتی یەکگرتوو، هەتا هەنگاوێك لە خوا نزیك تر بین نزیك تر دەبین لە یەکتری.[٢]

**٤٤.** مقصد تكوين الامة الوسطية: دروستکردنی ئوممەتی میانڕەو و ناوەندگیر، میانەڕەوی ئەو خەسڵەتەیە کە دەبێ هەم تاك هەم کۆمەڵگە پێیەوە پابەند بێت، چونکە زیادەڕەوی، یان کورت ڕەوی، (إفراط یان تفریط) هیچیان مەقبول نیین.

**٤٥.** مقصد السلام العالمي: دروستکردنی ئاشتی جیهانی، ئەگەر بێت و ئاشتی و ئەمنییەت هەبێت، ئیسلام لە هەموو دینەکانی تر زیاتر سوود دەبینێت و گەشە دەکات، خوای گەورە ناوی (السلام)ە، ئیسلام ناوی (السلم )ە، بەهەشت ناوی (السلام) ە، پەیوەندی نیوان خەڵك دەبێ سەلام و سەلام کردن بێت، ئەسڵ لە پەیوەندی نێوان خەڵك تەعاروف و سەلام و سیلم و ئاشتییە، شەڕکردن حاڵەتی نائاساییە.

**٤٦** مقصد التسامح الديني والانساني: لێبوردەیی ئایینی و مرۆیی، لێبوردەیی ئەو بنەمایەیە کە هەموو مرۆڤایەتی لەسەری کۆکە،

---

(١) (آل عمران: ١١٠).

(٢) (الأنفال: ٤٦).

کەس نییە بانگەشەی بۆ نەکات و شانازی پێوە نەکات، هەتا خوای گەورە لەگەڵ بێباوەڕانیشدا باسی ئەو ئامانجەی کردووە، وەك دەفەرموێت: { فَٱصْفَحِ ٱلصَّفْحَ ٱلْجَمِيلَ} (الحجر: ٨٥) صفح ڕوو لێوەرگێرانە بەجوانی، وەدەفەرموێ: { وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلاً} (المزمل: ١٠) دان بە خۆتدا بگرە لەسەر ئەو قسانەی کە دەیڵێن وە وازیان لێ بێنەو لێیان گەڕێ بە واز لێهێنانێکی جوان. وەدەفەر موێ: {فَٱصْبِرْ صَبرًا جَمِيلاً}.[١] واتە: کەوا بوو خۆت ڕابگرە (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) بە خۆڕاگرتنێکی چاك و جوان.

کەواتە الصفح الجمیل، والصبر الجمیل، والهجر الجمیل لەگەڵ کافرانیشدا فەرمان پێکراوە چ جای لەگەڵ مسوڵمانان.

**٤٧.** مقصد تکوین القوة: دروستکردنی هێز و قووەت، ئێمە کە باسی ئاشتی دەکەین مانای ئەوە نییە کە بڕوامان بە هێز نییە، بەڵام هێز بۆ بەرگریکردن و پاراستنی چەوساوە و موقەددەسات و مافی مرۆڤەکان و ڕەتکردنەوەی دەستدرێژییە، نەوەك داگیرکردن و خۆسەپاندن و قۆرخکردن و گەندەڵیکردن و مافی خەڵك بردن و....، وەك ئەوەی لە مرۆدا دەیبینین.[٢]

**٤٨.** مقصد التعرف علی الاعداء من الداخل والخارج: ناسینی دووژمنی ناوخۆیی و دەرەکی، هەرکەسێ ناحەزی دین و ژینی

---

(١) (المعارج: ٥).

(٢) (الأنفال: ٦٠).

نەناسێت دەکەوێتە داوی دوژمن بێ ئەوەی هەستی پێبکات، بەڵکو جاری وایە خزمەتی دوژمن دەکەی بەخۆت نازانی.[١]

**٤٩.** مقصد ترتيب الاولوية فى المصالح والمفاسد: ڕیزبەندی بۆ ئەولەویەت و سوودبەخش و زیان بەخشەکان، ئەمەش ئامانجێکی گەورەی قورئانییە، نابێ فرامۆش بکرێت، هەرکەس ئەولەویەت فەرامۆش بکات، دەستی خۆی دەبەستێت لە کارەکانی دین و دونیای، بەسەرهاتی موسا لەگەڵ پیاو چاکەکە کە ناوی (خدر) بوو ئەوەمان فێر دەکات: کە ئەم بەسەر هاتە لە ئایەتی ٦٠_٨٢، واتە بیست و دوو ئایەتی لەم سورەتە پیرۆزە گرتووە، وە لە چەندین شوێنی قورئان دا لە موناسەبەی جیاوازدا باسی کراوە.

**٥٠.** مقصد مراعاة الرخص والضروريات: ڕەچاوکردنی ڕوخسەت و پێویستییەکان، ئەسڵ ئەوەیە مسوڵمان پابەند بێت بە عەزیمەت و فەرمان و نەهییەکان، ئەگەر هۆکارێك نەبوو لامان بدا لەم ئەسڵە، بەڵام ئەگەر هۆکارمان هەبوو دەتوانین روخسەت بەکاربێنین، بەڵکو جاری وایە پێویست دەبێت، ئەسڵ وایە لە مانگی ڕەمەزاندا بەوڕۆژو بین، بەڵام ئەگەر نەخۆش بووین، یان لە سەفەر بووین، یان ئافرتان بیانوی تایبەتی خۆیان هەبوو بەڕۆژو نابن، وە نوێژیش هەر وایە، بەڵام لە سەفەردا کۆدەکریتەوە و کورت دەکریتەوە، یان بەهۆی باران و نەخۆشی کۆی دەکەینەوە،

---

(١) (الممتحنة: ١).

یان بەهۆی شەڕ و مەترسی گۆڕانکاری زیاتریشی بەسەر دا دێت، مردارەوەبوو حەڕامە بەڵام ئەی ئەگەر ناچار بووین؟ کوفر کردن جائیزە نییە بەڵام ئەدی ئەگەر فشارێکی ئەوەندە زۆرمان لەسەر بوو پێمان تەحەممول نەدەکرا؟ لە سیاسەتیشدا هەروایە، جاری وایە ناچاری لەگەڵ نەیارەکەت ڕێك بکەوی و بەڕواڵەت دەبێ تەنازوولیشی بۆ بکەی!.

**٥١.** مقصد الاهتمام بالشئ على قدر إهتمام القرآن به: گرینگیدان بە شتەکان بە ئەندازەی گرینگیدانی قورئان پێی، ئەم ئامانجە زۆر گرنگە، جاری وایە ئێمە لەسەر شتێك شەڕ دەکەین کە بەلای قورئانەوە هەر گرنگ نییە، وەك ناوی سەلەفیەت، سۆفیەت، ئەشعەری، ماتوریدی، فڵان مامۆستا، فڵان مەنهەج، کە دانراوی فڵان کەسە، لە کاتێکدا قورئان داکۆکی لەسەر یەکبوون و شوێن قورئان کەوتن و ڕازیبوون بە ناوی مسوڵمان و مردن بە مسوڵمانیەتییە، بۆیە دەبێ ئێمە گرنگی بەوە بدەین کە ئیسلام گرنگی پێداوە، ئەم خاڵە بابەتی هاوسەنگی و ئەولەویەت دەیگرێتەوە.

**٥٢.** مقصدالاهتمام بالمادية والروحية: گرینگیدان بە هەردوو لایەنی ماددی و ڕووحی، مرۆڤی مسوڵمان دین و دونیا بەیەکەوە کۆدەکاتەوە بەبێ ئەوەی ناکۆکی بخاتە نێوانیان، دونیا و دوارۆژ بەیەکەوە کۆدەکاتەوە، بێ ئەوەی پێی وابێت پێکەوە هەڵناکەن، پیکهاتەی ئێمە جەستە و ڕووحە، نابێ بەشی هیچیان فەرامۆش

بکەین، مسوڵمان با دەوڵەمەند بێت، بەڵام بە حەڕام و لەسەر حسابی خەڵك نا، وە نابێ لە ڕێی خراپدا سەرفی بکات، ناکرێ بەشی هەژاران نەدات، هەربۆیە هەرکاتێك زەمی دونیا کرا ئەوکاتەیە کە دەبێتە تاکە هیوا و ئامانج، وە قیامەت لەبیردەکرێت، دەنا دونیا کێڵگەی دوا ڕۆژە، وە پردی پەڕینەوەمانە بۆ دوارۆژ، وە تاکە دەرفەتە بۆ ڕەزامەندی خوا و بردنەوەی گرەو لە شەیتان و شەیتان سیفەتەکان.[١]

**٥٣.** مقصد ضرورة تطبیق الشریعة: جێبەجێکردنی شەریعەت، قورئان بۆیە هاتووە تا کاری پێ بکرێت، نەوەك وەلا بنرێت، بۆئەوە هاتووە سەرچاوەی دەستوری یاساکانی ژیان بێت، نەوەك لەناو مزگەوتەکان و سەر ڕەفتەکان، دەیان ئایەت باسی جێبەجێکردنی یاساکانی قورئان دەکەن، دوو جۆرە کەس دەیانەوێت لەم بوارەدا فێڵمان لێ بکەن، یەکەمیان: ئەوانەی وادەزانن شەریعەت تەنیا پەیوەندی مرۆڤە بە خواوە و هەندێك بواری مەدەنی ئەحوال شەخسییە، دووەمیان: دەزانن بەڵام خۆیان لێ بواردووە لەبەر بەرژەوەندی، دوژمنە گەورەکانیش تەنانەت بە بونیشمان قەڵسن چ جای فکر و تێڕوانینمان، بە دوو بەڵگە ئەم دینە بۆ جێبەجێکردن و تەتبیقە، یەکەم: دەقەکان زۆرن، دووەم: بەکردەیی زیاتر لە سێزدە سەدە جێبەجێکراوە، ئێمە ناڵێین کەم و کورتی نەبووە،بەڵام بە بەراورد بە بەرامبەرەکانی زۆر جوانتر و بەهێزتر و زانستی تر و واقیعی تر بووە، لەبەرامبەریشدا دەستمان بۆ شتێکی باشتر نەبرد،

---

(١) (الأعراف: ٣٢).

عەلمانیەت لە وڵاتانی خۆمان ئەوەی هەشیان بوو نەیهێشت، ئەو وڵاتانەی عەلمانییان بەسەردا سەپاندین هەرئەوان سەرچاوەی نەهامەتی و پارچە پارچە بوون و هەژاری و ناکۆکیان بوون.

**٥٤.** مقصد التیقن من خصائص القرآن: دڵنیایی بەرامبەر تایبەتمەندییەکانی قورئان، دەبێ دڵنیا بین کە قوڕئان چەند خاسیەت و تایبەتمەندییەکی هەیە کە لە هیچ پەرتووك و شەریعەتێکی تردا بوونی نییە، لەوانە:

خاصیة مصدره الالهی: تایبەتمەندی ئەوەی کە لە خواوە سەرچاوەی گرتووە. خاصیة الحفظ: تایبەتمەندی پاراستن. خاصیة التیسیر: تایبەتمەندی ئاسانکران. خاصیة الاعجاز: تایبەتمەندی تەحەددا و ئیعجاز. خاصیة البیان: تایبەتمەندی بەیان و ڕوونکردنەوە. خاصیة الکمال: تایبەتمەندی تەواوی. خاصیة العموم: تایبەتمندی گشتگیری. خاصیة الشمول: تایبەتمەندی هەمەلایەنی. خاصیه کونه خاتما للکتب السماویة: تایبەتمەندی کۆتا پەیام بوون و کۆتاهێنەر بە پەیامە ئاسمانییەکان. خاصیة کونه واقعیا: تایبەتمەندی واقعی بوون. خاصیة کونه مثالیا: تایبەت مەندی میسالی ئەوەیە تا مرۆڤ بیەوێ باڵا بڕوا، قورئان مەجالی بۆ کردۆتەوە، بەس نابێتە پێغەمبەر. خاصیة حصول الاجر العظیم لقرائته: تایبەتمەندی دەستکەوتنی پاداشتی زۆر بە خوێندنەوەی. خاصیة التناسق والسلامة من التناقض: تایبەتمەندی بەیەکەوە گونجان و هەماهەنگی و بەبێ بوونی ناکۆکی و دژبەیەکی.

**٥٥. مقصد الاهتمام باليوم الآخر:** گرینگیدان بە دوارِۆژ، بەڵگەکان لەسەر ئیمان بە دوارِۆژ یەکجار زۆرن، لەقورِئانی پیرۆز زۆر باسیکراوە، زۆر ناوی لێنراوە، دیمەنەکانی بە وردی بۆ ئێمە باسکراون، باسی قۆناغەکانی کراوە لە دەستپێکەوە کە دەستپێدەکات، نیشانەکانی دوارِۆژ، باسی تێکچونی دونیا، باسی زیندوبوونەوە، قوناغەکانی دوای زیندوبوونەوە، تا کۆتا هەوار باسی دۆزەخ و بەهەشت، من سەر ژمیرم نەکردووە، بەڵام بەسەدان ئایەت باسی دوارِۆژمان بۆ دەکات، قیامەت گرنگە چونکە شوینی ڕەنگدانەوەی تەواوی فەزڵ و دادگەری پەروەردگارە، لەوێدا ڕاستییەکان هەموو دەردەکەون و وەڵامی هەموو پرسیارەکان وەردەگرینەوە.

**٥٦. مقصد الايمان بالرسل:** باوەڕ بە پێغەمبەران، پێغەمبەران ـ سەلامی خوایان لێبێت ـ ڕاستترین و زاناترین و دڵسۆزترین و پاکترین و لێهاتوترینی مرۆڤایەتین، ئەوان نوێنەری خوان بۆ مرۆڤایەتی، هەتا ئێستاشی لەگەڵدابێت ئەم مرۆڤە گەورانە بێ هاوتا و مونافیسن، ئەگەر لە هەموو ئەوروپا پرسیار بکەی بڵێی کەسایەتی بێ ڕکابەر کێیە؟ بێگومان لە وەڵامدا دەڵێن: عیسای کوڕی مەریەمە، ئەگەر لە هەموو جیهانی سێهەم و زۆربەی وەڵاتان پرسیار بکەی کەسایەتی بێ ڕکابەر کێیە؟ دەڵێن: موحەمەدە، جا لای هیندۆسەکان و بوزایەکان و... هەر وایە.

**٥٧. مقصد الايمان بالكتب:** باوەڕبوون بە پەرتووك و پەیامە ئاسمانییەکان، خوای پەروەردگار پەیتا پەیتا شەریعەتی ڕەوانە

کردووە بۆ مرۆڤەکان، یاسای بۆ داناون بۆ ئەوەی سەریان لێ نەشێوێت و دین و دونیایان بە ڕێکوپێکی ڕایی بکەن، ئەم پەرتوکانە بەپێی پێداویستی و ئاستی خەڵکەکە بووە تا گەیشتە دوا قۆناغ کە قورئانی پیرۆز دابەزی، قورئان لە توانایدا هەیە _ بەکردەوەش سەلمێنراوە بەدەقە کانیش ڕوونە _ دوا پەیام بێت و وەڵامگۆی هەموو پرسیار و پێداویستیەکان بێت.

**٥٨.** مقصد الایمان بالملائکة: باوەڕبوون بە فریشتەکان.[١]

**٥٩.** مقصد الایمان بالقدر: باوەڕبوون بە قەدەر و قەزا، ئیمان بە قەدەر بریتییە لە چوار شت، یەکەم: بڕوابوون بە زانستی خوا، بڕوات بەوە هەبێت کە خوای گەورە هەموو شتێك دەزانێت. دوو: نوسینی پەوەرەردگار بۆ هەموو شتەکان، ئەم نوسینە هەندێکی فریشتەکانی لێ ئاگادارکردۆتەوە، بەڵام زانیاری تەواو بەس لای خۆیەتی. سێیەم: ویستی خوا لەسەر بەدیهێنانی شتەکان. چوارەم: وەدیهێنانی شتەکان بەپێی زانست و نوسین و ویستی خۆی، وە خوای گەورە ستەم لە کەس ناکات، خوای گەورە تاوان بە کەس ناکات بە ناچاری، خوای گەورە مرۆڤی ئازادکردووە لە هەڵبژاردنی ڕێگای خۆی، وە لە کوێدا توانای مرۆڤ پەکی کەوت یان زۆر لەژێر فشار دابوو تاوانێکی ئەنجامدا گوناهبار نابێت.

**٦٠.** بۆیە باسی ئیمان (بالله) ناکەین، چونکە هەموو بابەتەکان باسی ئیمان بە خوای پەروەردگارن.

---

(١) (البقرة: ٢٨٥).

**٦١. مقصد النهی عن الغلو فی الدین والصالحین:** نەهی کردن لە زێدەڕۆیی لە ئایین و پیاوچاکاندا، هیچ دینێك نییە پارێزراوبێت لەوەی کە شوێنکەوتووەکانی زیادەڕەوی نەکەن، خوای پەروەردگاریش ئاگادارمان دەکاتەوە لەڕێی ئەهلی کتابەوە کە زیادەڕەوییان کردووە لە بەرزکردنەوەی مرۆڤەکان بۆ ئاستی بە خوا کردن، وەك مەسیحیەکان کە کردیان.(١)

**٦٢. مقصد الزجر عن التفریط فی حق الله والصالحین:** ئاگاداری لە کەمتەرخەمی کردن لە مافی خودا و پیاوچاکان، ئەوەیان پێچەوانەی پێش خۆیەتی لە جاری یەکەمدا زیادەڕەوی دەکرا لە حەقی پێغەمبەران و پیاوچاکاندا، بەڵام لێرەدا باسی کەمتەرخەمییە لە حەق و مافی خوای گەورە، وە لە حەقی پێغەمبەران و پیاوچاکان، لەڕاستیدا جولەکەکان پێشەنگی ئەم بوارەن.(٢)

**٦٣. مقصد الاهتمام بالمقاصد والعلل والاسرار والحکم والغایات:** گرینگیدان بە مەبەست و هۆکار و نەهێنییەکان، لەڕاستیدا من زۆر شت هەیە باسم نەکردووە و زۆریش گرنگە، لەبەر ئەوەی نەمویست لەمە زیاتر درێژ بییەوە، ویستم ئەوە سەرەتایەك بێت بۆ خوێنەری بەڕێز بۆ ئەوەی بەئامانجەوە قورئان بخوێنێت، وە من بە تەرتیب و ڕیزبەندی باسم نەکردوون، چونکە لە قورئانیشدا

---

(١) (النساء: ١٧١).

(٢) (المائدة: ٦٤).

بەڕیزبەندی نەهاتووە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە ڕیزبەندی باش نییە، بەڵکو زۆریش باش و پێویستە، بەپشتیوانی خوا ئەگەر خوای گەورە تەمەنی پێداین دەتوانین بەوردی و بەڕیزبەندی باسی (مقاصد القرآن) بکەین ان شاء الله[١].

---

(١) ئا. حسن علی بۆسکێنی بە دەستکارییەوە.

## پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەران

یەکێکی دیکە لە بنەماکانی ئیمان و بیروباوەڕی ئیسلامی بریتییە لە باوەڕبوون بە پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەران.

خوای پەروەردگار بۆ هەموو نەتەوەکان پێغەمبەر و پەیامبەری ناردووە، تەنها خوای گەورە ژمارەیان دەزانێت.

خوای گەورە لە قورئاندا باسی بیست و پێنج پێغەمبەری کردووە، کە ئەوانیش بریتین لە:

ئادەم – باوکی مرۆڤایەتی- نوح – ئیدریس – هود - صالح – ئبراهیم – لوت – ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم – ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم – یەعقوبی کوڕی ئیسحاق – یوسفی کوڕی یەعقوب – شوعەیب – موسا – هارون – داود – سولەیمان کوری داود – ئەیوب – یونس – ئەلیەسەع – ذول کیفل – ئیلیاس – زەکەریا – یەحیای کوڕی زەکەریا – عیسا – موحەممەد (علیهم الصلاة و السلام).

### باوەڕبوون بە پێغەمبەران لە قورئاندا

(آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ). البقرة ( ٢٨٥ )

واتە: پێغەمبەر و ئیماندارانیش باوەڕیان هەیە بەوەی لە لایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی، (دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازیەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خوادا (لە باوەڕدا)، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان) پەروەردگارا لێخۆش بوونی تۆمان دەوێت و سەرئەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا). النساء ( ١٣٦ )

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەردەوام و دامەزراو بن لەسەر ئیمان بە خوا و پێغەمبەرەکەیی و بەو قورئانەش کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا داییەزاندووە بۆ پێغەمبەرەکەی و بەو کتێبانەش کە پێشتر ڕەوانەی کردوون، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە خوا و فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بەپێغەمبەرانی و بەرۆژی دوایی، ئەوە بەڕاستی گومڕابووە بەئەوپەڕی گومڕایی.

(سَابِقُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ). الحديد ( ٢١ )

واتە: (کەواتە) پێشبڕکێ بکەن بۆ بەدەستهێنانی لێ خۆشبوون لەلایەن پەروەردگارتانەوەو بەدەستهێنانی ئەو بەهەشتەی کە

پانیەکەی وەك پانتایی ئاسمان و زەوییە، ئامادەکراوە بۆ ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکانی، ئەویش خۆی زیادە ڕێزێکی تایبەتیە لەلایەن خواوە دەیدات بەو کەسانەی کە خۆی دەیەوێت، هەر خوا خۆی خاوەنی بەخشش و بەخشندەیی زۆر گەورە و بێ سنوورە.

(قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَالنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ) ال عمران ( ٨٤ )

واتە: (ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەی ئیماندار) بڵێ: باوەڕمان هێناوە بە خوا و بەوەی بۆمان نێرراوەتە خوارەوە و بەوەش کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی و بەوەش کە دراوە بە موسا و عیسا و پێغەمبەران لەلایەن پەروەردگاریانەوە و ئێمە جیاوازیی ناکەین لەنێوان هیچ کامیاندا و هەمووماں تەسلیم و ملکەچی ئەو پەروەردگارەین.

(وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ). غافر ( ٧٨ )

واتە: بەڕاستی ئێمە پێش تۆ پێغەمبەرانی تریشمان ڕەوانە کردووە، هەیانە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیانمان بۆ گێڕاویتەوە، هەشیانە کە سەرگوزەشتە و بەسەرهاتیمان بۆ نەگێڕاویتەوە، هیچ

پێغەمبەرێکیش بۆی نەبووە موعجزەیەك پێش بهێنێت بەبێ مۆڵەتی خوای بەدەستەڵات، جاکاتێك فەرمانی خوا هاتبێت، ئەوە جێبەجێ کراوە بەڕاستی، ئەوکاتە ئیتر ناحەق و نادروستەکان خەسارەتمەند بوون لەوێدا.

(إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ). فاطر ( ٢٤ )

واتە: بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە بە حەق و ڕاستیەکی تەواوەوە، تۆ مژدەدەری (ئیماندارانیت)، ترسێنەری (بێ بڕواکانیت) هیچ گەل و نەتەوەیەکیش نەبووە کە فرستادە و بێدارکەرەوەیەکی بۆ ڕەوانە نەکرابێت.

(وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ). یونس ( ٤٧ )

واتە: بۆ هەموو قەوم و گەلێك پێغەمبەرێك هەبووە، جا کاتێك (لەگۆڕەپانی مەحشەردا) ئەو پێغەمبەرەیان ئامادە دەبێت، لەسەر بنچینەی دادپەروەری داوەری دەکرێت لە نێوانیاندا و هیچ جۆرە ستەمێکیان لێناکرێت.

(إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا). النساء ( ١٥٠ )

واتە: بێگومان ئەوانەی باوەڕ بە خوا و پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانیدا (گوایە باوەڕیان بە خوا هەیە، بەڵام باوەڕیان بە پێغەمبەران نیە)، (یاخود) دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بە هەندێك لە پێغەمبەران و باوەڕ بە هەندێکیان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەك بۆ خۆیان بەدەست بهێنن ...

(أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا). النساء (١٥١)

ئا ئەو کەسانە بەڕاستی هەر بێباوەڕن و بۆ بێباوەڕان سزایەکی سەر شۆڕکەرمان ئامادەکردوە.

(وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلَمْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُولَٰئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا) النساء ( ١٥٢ )

ئەوانەی باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەرەکانی هێناوە و هیچ جۆرە جیاوازیەکیان نەکردووە لەنێوان هیچ کامیاندا و باوەڕیان بە هەموویان هەیە، ئا ئەوانە لەئایندەدا خوای گەورە پاداشتی خۆیان دەداتێ، خوای گەورەش هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە (بۆ باوەڕداران).

## پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت.) لە نێوان عەقڵ و قورئاندا

هەم عەقڵ و هەم قورئان پیغەمبەرایەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت.) دەسەلمێنن، ئێمە لێرەدا زۆر بە کورتی چەند بەڵگەیەکی عەقڵی و قورئانی دەخەینەڕوو:

١- مژدەدانی پەرتووکە ئاسمانییەکانی پێش پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت.) بە هاتنی کەسێك بەو ناو و شێوە و وەسفە.

٢- موعجیزاتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)، بۆ نموونە: لەتبوونی مانگ، ئیسرا و میعراج، هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانی، زۆرکردنی خواردنێکی زۆر کەم، گریانی دار خورما لەبەر خاتری ئەو و چەندانی تر.

٣- ڕاستگۆییەکەی، ڕاستگۆیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)، کەس نییە نکوڵی لێ بکات. هەتا دووژمنەکانیشی دان بەوەدا دەنێن کە بە مانای وشە ڕاستگۆ بووە و هەرگیزا و هەرگیز درۆیەکی لێ نەبیستراوە.

٤- ڕەوشت بەرزی، ڕەوشت بەرزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت.) شتێکە دوژمنەکانیشی نکوڵی لێ ناکەن، هەروەك خودای گەورە دەفەرموویێت ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾[1] واتا: بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی زۆر زۆر بەرزیت.

---

(١) [القلم، ٤]

٥- وەڵامی حازر و ئامادە بۆ هەموو پرسیارەکان، سەرەڕای نەخوێندەوارییەکەی. باشە دەکرێت کەسێکی نەخوێندەوار و شوان کە ڕۆژێ لە ئیش و کار بێت و شەو ماندووبێت، بەڵام وەڵامی حازر و ئامادەی پێ بێت بۆ هەموو پرسیارەکان؟!

٦- نەقۆستنەوەی خۆزاڵکردن و خۆ بەرزکردنەوە و خۆبەخوداکردن لە ناو خەڵکدا، خۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەیتوانی ئەو هەلومەرجە بقۆزێتەوە و خۆی بسەپێنیێت لە جیاتی ئایینەکەی، بەڵام ئایا وای کرد؟! هەر کەسێك غەیری پێغەمبەر ئەو هەلومەرجەی بۆ ڕەخسابووایە، وای دەرکرد، بەڵام چونکە پێغەمبەر نێردراوی خودایە ناکرێت وا بکات.

٧- تەحەداکردنی هەموو خەڵك، باشە کەسێکی نەخوێندەواری شوان ئەگەر لەلایەن خوداوە نەنێردرابێت چۆن دەتوانێت تەحەددای هەموو جیهان بە تایبەت عەرەب بکات؟ تەحەداکردن لە شتێکدا کە ئیختصاصی خۆیان بوو کە ڕەوانبێژی (بلاغة) بووە، بەڵام هەرگیزا و هەرگیز نەیانتوانی یەك ئایەتیش وەکو قورئان بێنن.

٨- پارێزرانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لەو هەموو دژایەتی کردن و پیلانرێژییەی بۆی کرا، هەروەها دەربازبوونی لە هەموو هەوڵەکانی تیرۆرکردن و لەناوبردنی. دیارە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ پاراستنی خودای گەورە، ئەگەر نا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) بەرگرییەکی وای نەبووە.

٩- نەبوونی بەرژەوەندی تایبەتی و کەسی و بنەماڵەیی، کە هەموو ژیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) بگەڕێی بەرژەوەندییەکی کەسی نابینیتەوە لە ژیانی خۆیی و دوای مردنیشی.

١٠- بە بنەماڵەیی نەکردن و بە میرات نەکردنی پێغەمبەرایەتی. باشە خۆ ئەگەر پێغەمبەرایەتی شتێکی کەسی و خودی بووایە واتا خودایی نەبووایە، ئەوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەیتوانی بە میرات بیگوازێتەوە و بۆ دوای خۆی، بەڵام ئایا وای کرد؟!

١١- هەواڵدانی بە شتی غەیب و پەنهان، بۆ نموونە هەواڵیداوە بەوەی کە دوای چەند ساڵێك شەڕێك لە نێوان ڕۆم و فارسدا ڕوودەدات و ڕۆمەکان سەردەکەون بەسەر فارسەکاندا، کە دیارە دەقا و دەق قسەکەی هاتە جێ.

یان بۆنموونە هەواڵیداوە کە کەس ناتوانێت بیکوژێت. (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾.[١]

یان هەواڵی ئەوەی داوە کە قورئان بۆ هەتاهەتایە دەپارێزرێت (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾.[٢]

---

(١) [المائده، ٦٧].

(٢) [الحجر، ٩].

یان هەواڵی ئەوەی داوە کە کەس ناتوانێت ئەو ئایینە تێك بشکێنێت و هەر دەمێنێت (أُولَئِكَ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ فَإِنْ يَكْفُرْ بِهَا هَؤُلَاءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَيْسُوا بِهَا بِكَافِرِينَ ﴿٨٩﴾.[1]

کەواتە کێ ئەو هەواڵانەی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دا؟

**١٢-** پتەویی تەشریعی ئیسلام، کە بەڕاستی سەیرە تەشریعێك (١٤٤٠) ساڵە هاتووە، بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ نوێتر و زیندووترە، ئایا کەسێکی نەخوێندەواری شوان دەتوانێت تەشریعێکی وا دابنێت کە بۆ هەموو سەردەم، کەس، کات، شوێن، کۆمەڵگا، زانا، نەزان، هەژار، دەوڵەمەند و... هتد، باش و گونجاو بێت؟!

کەواتە ئەگەر خودایەك پێی نەوتبێت چۆن دەیزانی؟

**١٣-** یەکخستنی ناوماڵ و دڵی عەرەب. ئایا کەسێك بەو نەخوێندەواری و بێدەسەڵاتییەوە دەتوانێت ئەو کارە بکات ئەگەر پشتیوانی خودایی نەبێت؟

**١٤-** وەرگیرانی هەموو دوعا و نزاکانی. ئەگەر خودایەك نەبێت وەڵامی نزاکانی دابێتەوە ڕاستەوخۆ، ئەی کێ وەڵامی داوەتەوە؟!

**١٥-** نەخوێندەوارێك جیهان فێر دەکات. ئایا دەچێتە عەقڵەوە کەسێکی نەخوێندەواری شوان، کە غەیری عەرەبیش هیچ

---

(١) [الانعام، ٨٩].




زمانێکی تری نەزانیوە، هەروەها ڕۆژێك لە قوتابخانە و زانکۆدا نەیخوێندووە، بەڵام ببێتە مامۆستا و فێرکار و پەروەردەکاری هەموو جیهان و مامۆستاکان و زاناکان کە جیهان و زانایان و فەیلەسوفان خۆیان بە قەرزداری ئەو بزانن؟! کەواتە دەبێت خودایەك هەبووبێت کە ئەویشی فێرکردبێت.

١٦- پەرستش و عیبادەتکردن لە نهێنی و دوور لە خەڵك، ئایا ئەگەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت.) درۆی کردبا –حاشای بەڕێزیان- و لەلایەن خودای گەورە نەنێردرایە، چۆن بەنهێنی و بە نیوەی شەو هەڵدەستایەوە بۆ عیبادەتکردن؟ خۆ ئەوکات دەیتوانی وا نەکات، چونکە خەڵکی ئاگایان لێ نەبووە. دەکرێت بەبێ بوونی خودایەك هەموو شەوێك هەڵسابێتەوە بۆ موناجات کردن لەگەڵیدا؟!

١٧- چۆن دەکرێت کەسێکی نەخوێندەوار و شوان ئایینێك بهێنێت کە:

گشتگیر بێت بۆ هەموو کەس و کات و شوێن و جیهان.

گشتگیر بێت بۆ هەموو بوارەکانی ژیان.

واقیعی و گونجا بێت بۆ هەموو باردۆخ و ژینگە و شوێن و کاتەکان.

میانڕە و دوور لە زیادەوڕەوی و کەمڕەوی بێت.

ڕوون و ئاشکرا و بێ گرێ و گۆڵ بێت.

کۆکەرەوەی نەگۆڕەکان و گۆڕاوەکانی سەردەمەکان بێت.

مرۆڤدۆست و گونجاوی تەواوی هەبێت لەگەڵ مرۆڤدا.

کەواتە ئەگەر خودایەك نەبێت ئەو پەیامەی ناردبێت، چۆن کەسێکی نەخوێندەواری وا دەتوانێت کاری وا بکات؟

١٨- داواکردنی شتی قورس لە خەڵکی، وەك: جیهاد، نوێژ، ڕۆژوو، حەج، زەکات و... هتد. ئایا کەسێك لەلایەن خوداوە نەنێردرابێت، ئەو داوا قورسانە دەکات کە لە بەرژەوەندی خۆی نییە؟! چونکە هەتا داوای شتی ئاسان بکات، باشترە بۆ وەڵامدانەوە و بەدواکەوتنی، عادەتی خەڵك وایە بە دوای شتی سووك و ئاسان دەکەون تاوەکوو شتی قورس.

١٩- بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) خۆی پەیوەست کرد بە شتانێك کە بێ پێویستە لەو شتانە، وەك شەو نوێژی بەردەوام؟ ئایا دەکرێت کەسێك لە خۆوە خۆی تووشی ئەو هەموو قورسییە بکات، بەبێ ئەوەی پێویستی پێی هەبێت؟!

٢٠- یەکبوونی لەگەڵ پەیامی هەموو پێغەمبەران و تێکنەگیرانی لەگەڵیاندا، کە دەبینین ئەو پەیامەی کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) هێناویەتی تەواو تەواو یەکاویەکە و هەماهەنگە لەگەڵ پەیامی هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام)، کەواتە دیارە سەرچاوەکەیان یەك کەسە کە خودای گەورەیە.

٢١- پاڵپشتیکردن و ستایشکردن و مەدح کردنی هەموو پێغەمبەران (علیهم السلام) لەلایەن پێغەمبەرەوە، ئایا ئەگەر سەرچاوەکەیان یەکێك نەبێت چۆن شتی وا دەبێت؟!

٢٢- زانیاری هەبوونی تەواو دەربارەی پێغەمبەرانی پێش خۆی، ئایا ئەگەر هەمان ئەو کەسەی کە ئەو پێغەمبەرانەی ناردووە (علیه السلام) ئەو پێغەمبەرەشی نەناردبێت، چۆن ئەو زانیارییە تەواو و دەقیقەی دەبێت لەسەر ئەو پێغەمبەرانە؟!

٢٣- پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر و نەخوێندەوارییەکەیی و موعجیزەکانی شتێکی موتەواتیرن، کە کەس نکۆڵیان لێ ناکات، هەتا دوژمنەکانیشی، ئەگەر خۆیان لە گێلی نەدەن نەچنە سەر مەزهەبی نکۆڵی کردن بەبێ بەڵگە.

کەواتە لێرەوە بۆمان دەرکەوت کە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) شتێکی خودی و ناوخۆیی نەبووە، بەڵکوو شتێکی دەرەکی خودایی بووە. ئەگەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) سەلما، ئەوا بەدڵنیاییەوە خودایەتی خودا و بوونی خوداش دەسەلمێنێت.

٢٤. دواکەوتنی وەڵام، زۆر جار وەڵامەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دواکەوتووە، کەواتە ئەگەر پێغەمبەرایەتی شتێکی خودی با، نەدەبوایە ڕاوەستابووا، بۆنموونە:

**١.** دواکەوتنی وەحی لە ڕوداوی (ئیفك) (بوختنان کردن بە عائیشە) مانگێك چاوەڕوانی کرد و هیچ وەڵامیکی لا نەبوو، دوای مانگێك ئایەتی بەری بوون و پاکی عائیشە دابەزی.

**٢.** دواکەوتنی وەحی لە گۆڕانی قیبلە.

**٣.** دواکەوتنی وەحی لە وەڵامی بێباوەڕەکانی قورەیش دەربارەی (ڕووح).

**٤.** دواکەوتنی وەحی لە ڕوونکردنەوەی ئایەتی موجمەل، بۆ نموونە: (وإن تبدوا مافی أنفسکم أوتخفوە یحاسبکم الله).

**٥.** دواکەوتنی وەحی لە بەسەرهاتی (المجادلة).

**٢٥.** لێخۆشبوون، لە چەندان ئایەت باسی لێخشبوون لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەکات:

(لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا).[1]

(عَفَا اللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ).[2]

هەندێك ئایەتی تر کە ڕەخنە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەگرن:

---

(١) الفتح (٢).

(٢) [التوبة، ٤٣].

(مَاكَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾).[١] واتا: ((نەدەبوو پێغەمبەر و باوەڕداران داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ موشریکەکان، ئەگەرچی ئەو موشریکانە خزمیشیان بن.))

هەروها دەفەرمووێت: (مَاكَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾).[٢] واتا: ((هیچ پێغەمبەرێك بۆی نییە دیل ڕابگرێت، تا ئەوکاتەی بە تەواوی بە جەنگ زاڵ دەبێت بەسەر موشریکەکانی سەر زەویدا.))

(وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ).[٣]

(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ ۖ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ).[٤]

**٢٦.** قورئان خۆی گەورەترین بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.)

---

(١) (التوبة ١١٣).

(٢) [الأنفال، ٦٧].

(٣) [التوبة، ٨٤].

(٤) التحريم (١).

بە هیچ جۆرێك ناكرێت و ناگونجێت، قورئان قسەی مرۆڤ بێت هەرچەند ئاستی زانستی و هزریشی بەرز بێت، هەرچەندە خوێندەوار و بیرمەندبێت، هەرچەند لە ژینگەیەكی فوول فوول زانستی و فیكری پەروەردە بووبێت، چ جای قسەی كەسێكی نەخوێندەواری وەك پێغەمبەری خودا بێت (دروودی خودای لەسەر بێت.) كە ڕۆژێك لە ڕۆژان نەیخوێندووە و مامۆستا و پەروەردەكارێكی نەبووە و لە ژینگەیەكی دەشتەكی و نەخوێندەوار پەروەردە بووە، خەریكی كەسابەت و شوانیەتی بووە. ئێمە لێرەدا خوا نەخواستە مەبەستمان ئەوە نییە كە بڵێین پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) نەزان و نەفام بووە! بەڵكوو مەبەستمان ئەوەیە كە كەسێكی نەخوێندەوار بووە و هیچ مامۆستا و پەروەردەكارێكی نەبووە غەیری خودای گەورە، كەواتە تاكە مامۆستای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) خودای گەورەیە -سبحانە وتعالی-. كەواتە زانایی و گەورەیی و فەزڵی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەگەڕێتەوە بۆ قورئان و هەڵبژاردنی لەلایەن خودای گەورەوە، ئەگەرنا ئەگەر ئەو دوو شتەی لێ دابماڵرێ –قورئان (وەحی)، پێغەمبەرایەتی _ ئەوا ئەویش وەك هەر كەسێكی تر دەبێتە كەسێكی ئاسایی و مرۆڤێكی سروشتی وەك مرۆڤەكانی تر.

## چۆن بزانین قورئان قسەی خودایە؟!

**وەڵام:**

**١- پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) خۆی دانی بەوەدا دەنێت کە قورئان پەیام و قسەی خودای گەورەیە و خۆی دان بەوەدا دەنێت کە ئەو تەنها گەیەنەری پەیامی خودایە و بەس، ئیتر نە وەکیلی خودایە و نە خودایە و نە سێبەری خوداشە، بەڵکوو مرۆڤێکە وەك هەموو مرۆڤەکانی تر. ئەوەتا خودای گەورە دەفەرمووێت (وَإِنَّهُ لَتَنْزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنْذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾).[1] واتا: ((بەڕاستی ئەو قورئانە لەلایەن خودای پەروەردگاری جیهانەکانەوە ڕەوانەکراوە، جبرەئیلیش دایبەزاندووە.))**

**هەروەها دەفەرمووێت: (قُلْ مَا كُنْتُ بِدْعًا مِنَ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿٩﴾).[2] واتا: ((ئەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) پێیان بڵێ: کە من یەکەم پێغەمبەر و تازە پەیدابوو نیم، ناشزانم چیم بەسەر دێت، چیش بەسەر ئێوە دێت، من تەنها شوێنی ئەو وەحیە دەکەوم کە بۆم دێت...))**

---

(١) الشعراء (١٩٢ – ١٩٦).

(٢) [الأحقاف، ٩].

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴿١١٠﴾﴾.[١] واتا: ((ئەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت.) پێیان بڵێ: بە ڕاستی من تەنها مرۆڤێکم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحیم بۆ دێت...))

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ ۚ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾﴾.[٢] واتا: ((پێغەمبەر ئیمانی هێنا بەوەی بۆی دابەزێنراوە لەلایەن پەروەردگارییەوە...)) کەواتە ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ناڵێت هی خۆمە و دەڵێت هی خودایە.

هەروەها دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ ۖ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ ۚ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾﴾.[٣] واتا: ((ئەی پێغەمبەر، ئەوە بگەیەنە کە بۆت دابەزیوە لەلایەن پەروەردگارەوە...))

---

(١) [الكهف، ١١٠].

(٢) [البقره، ٢٨٥].

(٣) [المائدة، ٦٧].

هەروەها دەفەرموویت: (مَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾).[١] واتا: ((ئەوەی لەسەر پێغەمبەرە تەنها گەیاندنی قورئانە...))

٢- عەرەب بەو هەموو ڕەوانبێژی و بەلاغەتەوە نەیانتوانی هاوشێوەی قورئان بهێنن. ئەگەر قورئان قسەی مرۆڤە، بۆ نەیان دەتوانی؟!

ئەوەتا خودای گەورە تەحەددایان دەکات:

(وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾).[٢]

(أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٣٨﴾.[٣] (أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِعَشْرِ سُوَرٍ مِثْلِهِ مُفْتَرَيَاتٍ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٣﴾.[٤]

کەواتە قورئان داوایان لێ دەکات:

---

(١) [المائدة، ٩٩].

(٢) [البرقه، ٢٣].

(٣) [البرقه، ٢٣].

(٤) [هود، ١٣].

**یەکەم:** سوورەتێك بهێنن.

**دووەم:** دە سوورەت بهێنن.

**سێیەم:** کەلامێك بهێنن وەك قورئان.

کە نەیانتوانی و ناشتوانن، کەواتە ناکرێت قسەی مرۆڤێکی ئاسایی و شوانێك بێت.

**٣-** هیچ عەقڵێك ئەوە قبووڵ ناکات کەسێك جوانترین و باشترین و ناوازەترین بەرهەمی (فیکری) خۆی بداتە پاڵ کەسێکی تر، لە کاتێکدا هیچ ڕێگرییەکیش نەبێت، ئایا شتی وا دەبێت؟!

بە پێچەوانەوە زۆرێك لە خەڵکی شتی ئەولا دەدزن و دەیکەن بە قسەی خۆیان و خۆیانی پێ بەناوبانگ و دەوڵەمەند دەکەن و بۆ بەرژەوەندی تایبەتی بەکاری دەهێنن.

بەڵام لێرەدا هەندێك دەڵێن: بۆ پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێت) پاڵی داوە بۆ لای خودا، بۆ ئەوەی وەرگیراو بێت و بەزوویی پێی سەرسام و ملکەچ بن و بە پیرۆز سەیری بکەن، ئێمە بەو شێوەیە وەڵامی دەدەینەوە:

**١-** پێغەمبەر(درووودی خودای لەسەر بێت.) هەرگیز درۆی لێ نەبیستراوە، بە شاهێدی دوژمنانیش.

**٢-** پێغەمبەر(درووودی خودای لەسەر بێت.) هەموو قسەکانی پاڵ نەداوە بۆ لای خودا، بەڵکوو سێ جۆر قسەی هەبووە:

«قورئان» کە کەلامی خودایە.

«فەرموودە» کە قسەی خۆیەتی، بەڵام زۆربەیان لەلایەن خوداوە پێی ووتراە.

«فەرموودەی قودسی» کە واتاکەی هی خودایە و وتەکە هی پێغەمبەرە.

باشە کەوایە بۆ هەموویانی پاڵنەدایە لای خودای گەورە؟!

**٣-** ئەو قورئانە لە هەموو ڕووەکانەوە (عەقیدەیی و فیکری و تەشریعی و... هتد) لە ئاستێکی زۆر بەرز دایە، کە ناکرێت قسەی کەسێکی نەخوێندەوار بێت کە لە شوێنێکی دوور لە زانست و خوێندەواری و شارستانی ژیاوە.

**٤-** ئەو قورئانە هەواڵی زۆر زۆری تێدایە، بەنیسبەت ڕابردووی پێغەمبەر و داهاتووی ئەو، کە هەموویان بەڕاست گەڕاون.

**٥-**ئەو قورئانە سەرزەنشتی پێغەمبەری کردووە ئەوەتا دەفەرمووێت: (عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾).[١] واتا: ((ڕووی گرژو و مۆن کرد...))

**٦-** ئەو قورئانە هەڕەشەی تێدایە بۆ پێغەمبەر، ئەوەتا دەفەرمووێت: (وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾).[٢]

---

(١) [عبس، ١-٣].

(٢) [الحاقە، ٤٤- ٤٦].

واتا: ((ئەگەر محمد (دروودی خودای لەسەر بێت.) هەندێك قسەی بەدەم ئێمەوە هەڵبەستایە، ئەوا بەهێز و دەسەڵاتی خۆمان دەمانگرت و زەلیل و سەرشۆڕمان دەکرد و لە پاشاندا ڕەگی دڵی دەپچڕێنین و دەیمرێنین.))

٧- ئەوەتا قورئانە ڕەخنەی لە پێغەمبەر گرتووە، کە دەفەرمووێت: (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾).[١] واتا: ((نەدەبوو پێغەمبەر و باوەڕداران داوای لێخۆشبوون بکەن بۆ موشریکەکان، ئەگەرچی ئەو موشریکانە خزمیشیان بن...))

هەروەها دەفەرمووێت: (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾).[٢] واتا: ((هیچ پێغەمبەرێك بۆی نییە دیل ڕابگرێت تا ئەوکاتەی بە تەواوی بە جەنگ زاڵ دەبێت بەسەر موشریکەکانی سەر زەویدا.))

٨- بابەتەکانی ئەو قورئانە بەو ڕێکی و جوانی و گونجاوییە ناکرێت کەلامی مرۆڤ بێت، چونکە بە شێوەیەکی گشتی قورئان چوار جۆر بابەت باس دەکات:

---

(١) [التوبة، ١١٣].

(٢) [الأنفال، ٦٧].

١- بنەمای زانستە ئایینی و مرۆییەکان، وەك: عەقیدە، بیرو باوەڕ و فیکر، زانستە یاساییەکان، زانستەکانی وەك فیزیا و فەلەك و پزیشك و جیۆلۆجی و زانستە کۆمەڵایەتیەکان و فەلسەفە و هتد.

٢- ئیعجازی زانستی «فیزیا، فەلەك، پزیشکی...» و «بەلاغی» و «زمانەوانی» و «تەشریعی» و «ژمارەیی» و...

٣- بابەتە مێژووییەکان وەك: هەواڵی پێغەمبەران و گەلان و شارستانیەتەکانی پێشوو.

٤- بابەتە داهاتووییەکان (هەواڵی ڕووداوەکانی داهاتوو).

کە بە ڕاستی هەر یەکیك لەوانە هەرگیزا و هەرگیز لە کەسێکی نەخوێندەوار کە لە ژینگەیەکی نەخوێندەوار و دواکەوتوودا ژیاوە ناوەشێتەوە.

٩- پێغەمبەر هەموو کاتێك وەك ڕاڤەکارێك و موفەسیرێك مامەڵەی کردووە، نەك وەك دانەری قورئان، هەروەك خودای گەورەش دەفەرمووێت: (بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾).[١] واتا: ((قورئانمان بۆ تۆ دابەزاندووە، تاوەکوو بۆ خەڵکی ڕوون بکەیەوە...)) کەواتە لێرەوە پێغەمبەر ئەرکەکەی دیاریکراوە و پێی وتراوە کە تۆ گەیەنەر و ڕاڤەکاری قورئانی، نەك دانەری قورئان.

---

(١) [النحل، ٤٤].

**١٠-** هەندێك جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) ڕاوەستاوە لە ڕاڤەکردنی ناوەڕۆکی ئایەتەکە و مەبەستەکەی، هەتاوەکوو ئایەتی تر دابەزیوە.

ئەگەر هی خۆی بووایە بۆچی دەوەستا و بۆچی تێنەدەگەیشت؟

**١١-** دابەزینی قورئان لە کاتی جیاوازدا، کە پێغەمبەر هیچ ویست و ئیختیارێکی نەبووە، بۆ نموونە جاری وا هەبووە لە خەودا هاتووە، یان لەسەر وشتر، یان کاتێك کە لەگەڵ هاوەڵانی دانیشتووە، هەتا زۆر جار تووشی بارقورسییەکی زۆر دەبوو و ئارەقەیەکی زۆری دەکرد و نارەحەت دەبوو، باشە ئەگەر قسەکە هی خۆی بێت بۆ دەبێت بەو شێوەیە بێت؟!

**١٢-** مرۆڤ عادەتەن کوڕی ژینگەکەی خۆیەتی لەو ڕۆشنبیریەی کە دەیبینێت و لەو واقیعەی بەرچاوی دەکەوێت، بۆیە پێویستە پێغەمبەر بەو شێوەی قسە بکات کە بینیویەتی و بیستوویەتی لەو میراتە جاهیلەی کە لەو کاتەدا هەبووە لە هۆنراوە و چیرۆك و شەڕ و جەنگ...

بەڵام ئایا پەیامی پێغەمبەری خودا وابووە؟!

ئایا هات درێژە پێدەری ئەوە بێت کە هەیە، یان ئەوەی خراپە بیگۆڕێت؟

هەموو کەسێك شێوازێك نووسین و قسەکردنی هەیە، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) سێ جۆر قسە و نووسینی هەبووە: «قورئان، فەرمودەی خۆی و فەرمودەی قودسی».

**١٣-** قورئان ئەگەر قسەی مرۆڤ بووایە، دەبوو دەستکاری کرابووایە و تێکدرابووایە، بەڵام ئایا قورئان دەستکاری کراوە، ئەوەتا قورئان دەفەرموویێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾).[1] کەواتە خودی ئەو وەعدە بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە قورئان کەلامی خودایە -سبحانه وتعالى-.

کەواتە هەم عەقڵ و هەم وەحی (قورئان) پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری سەلماند.

## تایبەتمەندی پێغەمبەران

پێغەمبەران هەموویان مرۆڤ بوونە و سیفەتی مرۆڤیان تێدا بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ سیفەتیان هەبووە:

**١.** پارێزراو بوونە لە گوناهـ و تاوان.

**٢.** هەر چی خودای گەورە پێی گەیاندوون گەیاندوویانە.

**٣.** ڕاستگۆ بوون.

**٤.** زیرەك و لێهاتوو و بیرتیژ بوون.

**٥.** بێ عەیب بوون (ساغی و سەلامەتی ناوەکی و دەرەکی).

**٦.** ڕەوشت بەرزی.

کەواتە هۆکاری ناردنی پێغەمبەران (علیهم السلام) بەکورتی:

---

(١) [الحجر، ٩].

**١)** بانگکردنی خەڵکی بۆ خودا ناسی و خوداپەرستی ڕاستەقینە و دوورکەوتنەوە لە غەیری خوداپەرستن، وەك خودای گەورە دەفەرموێت ((وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ))[١] واتە (سوێند بە خودا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها خودا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر، جا هەبوو لەو خەڵکە (کە بیر و هۆش و ژیری خۆی خستەکار و بەشوێن ڕاستیدا دەگەڕا) خودایش هیدایەتی دەدا، هەشیان بوو خۆی شایستەی گومڕایی دەکرد و بەسەریدا دەچەسپا، کەوابوو بگەڕێن بەسەر زەویدا و سەرنج بدەن، بزانن چۆن بوو سەرەنجامی ئەو کەسانەی بڕوایان بە بەرنامەی ئێمە نەبوو).

**٢)** زۆر شت هەیە مرۆڤ عەقڵی دەرکی ناکات بۆنموونە: هۆی بوونی مرۆڤ و ئامانجەکانی لە ژیاندا و زانینی ڕاستێتی ڕۆح و لاشە و پێویستیەکانیان، زانینی جیهانی شاراوە (عالم الغیب) و ڕووداوەکانی.

**٣)** ئەگەر خەڵکی پشتگوێ بخرایە ئەوا دەبوونە بەندەی هەواو ئارەزوو وە هەرچی خراپە هەیە دەیان کرد و یەکتریان دەچەوساندەوە و کەس حیسابی بۆ کەس نەدەکرد، چونك پێی

---

(١) (النحل:٣٦).

وابوو ئەویش حەیوانە و مانەوە بۆ بەهێزەکانە و یاساکانی دارستانیان جێبەجێ دەکرد.

٤) گەیاندنی پەیامی خودا بە خەڵکی، وەك دەفەرموێت: ((الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالَاتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا اللَّهَ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ حَسِيبًا )).[١] واتە (ئەوانەی کە پەیامەکانی خودا دەگەیەنن، وە لەو دەترسن و جگە لەو لە هیچ کەسی تر ناترسن، خودا خۆی بەسە کە پاداشتی (چاکەکاران بداتەوە و لە بێ باوەڕانیش بپرسێتەوە).

٥) فێرکردن و پاککردنەوەی دڵ و دەروونی شوێنکەوتووەکانیان وەك دەفەرموێت: (( هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ )).[٢] واتە (هەر ئەو زاتەیە لەناو خەڵکێکی نەخوێندەواردا پێغەمبەرێکی لە خۆیان ڕەوانە کرد، ئایەتەکانی قورئانەکەی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە و دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە گوامڕایی و سەرلێشێواویەکی ئاشکرادا گیریان خواردبوو).

---

(١) (الأحزاب:٣٩).

(٢) (الجمعة:٢).

**٦)** ڕوونکردنەوەی دەقی ئەو فەرموودانەی خودای گەورە ناردوونی، وەك دەفەرموێت: ((**بِالْبَيِّنَاتِ وَالزُّبُرِ وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ**)).[١] واتە (ئێمە ئەوانمان ڕەوانەکردووە هاوڕێ لەگەڵ بەڵگەو نیشانەو (موعجیزە) ی زۆر و کتێبی ئاسمانیدا و ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاند، تا بۆ خەڵکی ئەوە ڕوون بکەیتەوە کە بۆیان هێنراوەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی بیرێك بکەنەوە و تێفکرن).

**٧)** پێشەوایەتی کردن و پێشەنگ بوون بۆ خەڵك.

## هەموو نەتەوەیەك پێغەمبەری خۆی هەیە

بەهۆی ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورەوە هیچ نەتەوە و جیل و نەوەیەك نەبووە کە خوای گەورە پێغەمبەری بۆ نەناردبن، بەڵکو بۆ هەموو نەوە و نەتەوەکان پێغەمبەری ناردووە، بانگی کردوون بۆلای خوای گەورە و مژدەی داوە بە چاکەکاران و خراپەکارانی ترساندووە و ئاگاداری کردوونەتەوە لە سزای خوای گەورە، بۆ ئەوەی بیانوی خەڵکی نەمێنێت و بڵێن نەمانزانی.

---

(١) (النحل:٤٤).

## بنچینەی پەیامەکان یەکن

هەموویان بانگەوازی دەکەن بۆ:

١- باوەڕهێنان بە خوای گەورە، وە ئەو سیفەتانەی کە پێویستە بۆی بڕیار بدەین، وە باوەڕبوون بە پاکیەتی و دووری خوای گەورە لە هەموو کەم و کوڕیەك.

٢- باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی و ئەو ڕوداوانەی کە لەو ڕۆژەدان لە زیندوکردنەوە و لێپێچینەوە و پاداشت و سزا و بەهەشت و دۆزەخ.

٣- ئەنجامدانی کاری چاك و ڕەوشت بەرزی.

وەهەمووشیان: بەرمان لێدەگرن و ئاگادارمان دەکەنەوە لە مەترسی:

١- هاوبەشدانان بۆ خوای گەورە.

٢- گومانکردن لە ڕاستی ڕۆژی دوایی.

٣- ئەنجامدانی کاری خراپ و ڕەوشتی ناشیرین.

## بۆ پێغەمبەران هەموویان نێربوون و مێیان تێدا نەبووە؟

١. زۆر بارودۆخ و حاڵەت بەسەر ئافرەتدا دێت کە ڕێگرن لە زۆر شت، بۆ نموونە: سوڕی مانگانە و منداڵبوون و بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منداڵان و ئەرکی ماڵەوە و...، هەموو ئەمانە

بەربەست و ڕێگرن لەوەی کە ئافرەت بەتەواوی بەم ئەرکە هەڵبستێت، باشە ئافرەت کە منداڵی دەبێت یان لە کاتی حەملدا، ئایا دەتوانێت ئەو حاڵەتەی خۆی جێبێڵێت و هەڵبستێت بە ئەرکی قورسی پێغەمبەرایەتی؟! پێغەمبەرایەتی پێویستی تەواو و هەمیشەیی هەیە بۆ بوون لەناو خەڵکدا، دەکرێ بە دەیان ڕۆژ خەڵك جێبێڵێت لەبەر بارودۆخە تایبەتەکانی؟!

**٢.** بە پێی مێژووی ڕابردووی مرۆڤایەتی، بەشێوەیەکی گشتی، ژن پێگەیەکی وای نەبووە لەناو کۆمەڵگەدا کە بتوانێت بەم کارە هەڵبستێت، نەك ئەوە بەڵکو لە زۆر شوێن و کات و کۆمەڵگەدا هەر بە مرۆڤیش دانەنراوە! بەڵام ئیسلام هەموو مافەکانی بۆ ئافرەت گێڕایەوە.

**٣.** پێغەمبەرایەتی لە زۆربەی کات و شوێندا پێویستی بە بانگەوازی تاکەکەسی و خەڵوەت کێشاندا هەیە لەگەڵ خەڵدا، واتە یەك یەك لەگەڵیان دانیشێت، چونکە ئەم جۆرە بانگەوازەی ئەوان نوێ و نامۆ بووە بەم نەریت و بیر و باوەڕەی ئەوان، بۆیە ئەم خەڵوەت کێشانە لەگەڵ تاك بەتاکی ئەم هەموو پیاوە بۆ ژن ناگونجێت.

**٤.** ژن بە سروشتیی خۆی بەسۆز و میهرەبان و ناسکە، پێغەبەرایەتیش هەڵوێست و بارودۆخی سەخت و سەیری تێدایە، بۆیە لەزۆر کاتدا ئەم هەستە ناسکەی ژن ناگونجێت لەگەڵ پێشهاتەکانی پێغەمبەرایەتیدا.

٥. پێغەمبەران بە درێژایی مێژوو بەشیان لێدان و دەربەدەری و کوشتن و...، بووە، بۆیە ئەمە بۆ ئەوان دەبێتە ئەرك و بارێکی زۆر کە هەڵگرتنی وا ئاسان نییە.

تێبینی: بۆچوونێك هەیە پێی وایە پێغەمبەران بەس لە پیاوان نەبوون بوون، بەڵکو پێغەمبەری ژنیشمان هەبووە! خاوەنی ئەم بۆچوونە: ئیبن حەزم، قورتبی، ئەبولحەسەنی ئەشعەری.[١]

پێغەمبەرەکانیش ئەمانەن: حەوای دایکمان، مریەم، سارە، دایکی موسا، هاجەرە، ئاسیەی هاوسەری فیرعەون).

## ئایا پێغەمبەران هەڵەیان هەبووە:

پێغەمبەران (علیهم السلام) وەك لە قورئاندا باسیان لێوەکراوە بەڵێ هەڵەیان هەبووە، بەڵام گوناهو و تاوانی گەورەیان نەبووە، وە هەڵەکانیشیان تۆمارکراوە و ڕۆژانە و بەدرێژایی ژیان مرۆڤەکان دەیخوێننەوە! بەڵام کە دەڵێین هەڵەیان هەبووە و گوناهو تاوانیان نەبووە، مانای چییە؟ هەڵە جیاوازە لە گوناهو و تاوان، هەڵە ئەوەیە بە هەڵە دەکرێت نەك بە ئەنقەست وە مەبەستیش لێی بچووکە نەك گەورە.

وە دەبێ ئەوەش لێك جیا بکەینەوە، کە دوو قوناغمان هەیە: قوناغی پێش پێغەمبەرایەتی، لەگەڵ قۆناغی دوای پێغەمبەرایەتی،

---

(١) فتح الباري، ابن حجر العسقلاني: ٦/ ٤٤٧، وتفسير القرطبي: ٨٣/٤.




وە دوو جۆر گوناهیشمان هەیە: گوناهی گەورە و گوناهی بچووك، کەواتە پێش پێغەمبەرایەتی و دوای پێغەمبەرایەتیش پێغەمبەران پارێزاربوونە لە گوناهی گەورە، بەڵام پێش پێغەمبەرایەتی ئاساییە گوناهی بچووکیان کردبێت بە هەڵە و وەك سیفەتێکی مرۆڤ بوون، بەڵام لەسەری بەردەوام نەبوونە و ئاگادارکراونەوە، چونکە لە داهاتوودا دەبن بە پێغەمبەر و ناکرێت لەسەر ئەم شتانە بەردەوام بن و کەسایەتییان لەکەدار ببێت.

بەڵام ئەوەی هەبووە و لێیان ڕوویداوە، یەکەم: یان بە هەڵەبووە. دووەم: یان لەبیریان چووەتەوە. سێیەم: یان پێش بوون بە پێغەمبەر و پەیامهێنی بووە.

## حیکمەت و فەلسەفەی تۆمارکردنی هەڵەی پێغەمبەران لە پەرتووکە ئاسمانیەکاندا بە تایبەت قورئان

**١.** دەرخستنی ڕاستگۆیی پێغەمبەران، چونکە بە ڕاگەیاندن و گەیاندنی ئەم جۆرە شتانە خۆیان شایەتیان لەسەر خۆیان داوە! وە پەیامی خواییان گەیاندووە با بە دەرخستنی هەڵەی خۆشیان بێت.

**٢.** گەڕانەوە و تەوبەکردن لەدوای هەڵە و گوناهو تاواندا، پێغەمبەران بە پێغەمبەرایەتی خۆیان لە دوای هەر هەڵەیەك پەنایان بردووە بۆلای خوای گەورە و لاڵاونەوە، کەواتە ئەگەر ئەوان وابوو بن! ئەی دەبێ ئێمە چۆن بین؟!

**٣.** مرۆڤ هەرچەند گوناهو تاوان و هەڵەشی هەبێت بەڵام ئەوە ناگەیەنێت کە لە ئیمان و ئایین دەرچووە.

**٤.** مرۆڤ هەرچەندە گەورە و لەخواترس و.... بێت، بەڵام هەر شایەنی هەڵە و گوناهو و تاوانە، ئەوەی گرینگە داوای لێبوردن و گەڕانەوەیە بۆلای خوا و ڕاستی و حەقیقەت.

### ئەرکی ئێمە بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ:

**١.** گوێ ڕایەڵی.

**٢.** خۆشەویستی.

**٣.** ئەزیەت نەدانی.

**٤.** ڕێزگرتنی.

**٥.** سڵاواتدان لەسەری.

**٦.** بیکەینە پێشەنگ و چاوی لێ بکەین.

**٧.** شوێنپێ هەڵگرتنی هەنگا و بە هەنگاو.

**٨.** بەرگریکردن لێی بە هەموو جۆرەکانییەوە.

**٩.** شارەزابوونی تەواو لە ژیان و مامەڵە و هەڵسوکەوت و فەرمووده و سوننەتەکانی.

مرۆڤبوونی پێغەمبەران گەورەترین جوانی بەخشیوە بە پێغەمبەرایەتی، وە بوون بە سمبوول و پێشەوای زۆر جوان و بەرز بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی، ئەگەر مرۆڤ نەبان ئەوە ئەوکات مرۆڤ بەهانەی دەبوو بۆ سەیر نەکردن و شوێن نەکەوتنیان، بۆ نموونە پێغەمبەرمان محمد ﷺ سمبوولی هەموو کایەکان بووە! هەروەك باسیشمانکرد یەکێ لە کاری پێغەمبەران سەرمەشقی و پێشەوایەتی مرۆڤە.

## سەرمەشقی و پێشەوایەتی محمد ﷺ

﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا﴾[١]. واتە: (بەڕاستی لە پێغەمبەری خودادا ﷺ بۆ ئێوە هەیە باشترین و چاکترین سەرمەشقی پێشەوایەتی و نموونەی تەواو و جوان بەتایبەت بۆ ئەوکەسانەی ڕەزامەندی خودایان لا مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، وە زۆر یادی خودادەکەن، زمانیان پاراوە بەناوی ئەو).

ئەو ئایەتە قورئانیە پەیوەستە بە گەورەترین و بەرزترین مرۆڤ، کە پێغەمبەرە ﷺ ئاماژە بەوە دەکات کە ئێمە لەهەر بوارێك بمانەوێت سەرمەشق و پێشەواو نموونەی تەواو و جوانمان هەیە، کە پێغەمبەرە ﷺ، بەتایبەتتر ئەوانەی ڕەزامەندی خودایان لا مەبەستە و وە دەیانەوێت خودا لە خۆیان ڕازی بکەن،

---

(١) الأحزاب: ٢١.

وە دەیانەوێت لە قیامەتدا سەرفراز بن، کەواتە هەرکەسێك دەیەوێت خودا لە خۆی ڕازی بکات، وە سەرفرازی دونیا و قیامەت بێت، با پێغەمبەر ﷺ بکاتە سەرمەشق و پێشەوای خۆی ، چونکە ئێمە لە هەر بوارێك بڕوانینە پێغەمبەر ﷺ پەکمان ناکەوێت.

## پێویستی مرۆڤایەتی بە پێغەمبەران

لە دیدی بڕواداردا مرۆڤ و گەردون دروستکراوی خودای گەورەن، کەواتە ناکرێت و نابێت خودای گەورە مرۆڤ دروست بکات بەڵام لێی گەڕێت و هیچ ڕێنمونی و ڕێپیشاندەرێکی بۆ نەنێرێت.

بڕوانە هەر شەریکە و کۆمپانیێیک کە بەرهەمێك دروست دەکات ڕاستەوخۆ شتێکی لەگەڵ دادەنێت بۆ چۆنییەتی بەکارهێنانی، واتە هەموو ئەو شتانەی تێدایە بۆ کارپێکردن و پاراستنی ئەم بەرهەمە پێویستن. کەواتە ناکرێت خودای گەورە گەورەترین و بەنرخترین و بەرزترین دروستکراوی خۆی ئیهمال بکات و بەبێ ڕێنمونی و ڕێپیشاندەر و پێشڕە و پێشەوا جێ بێڵێت.

بەڵام دیارە نەوەك هەر دەربارەی پێغەمبەرایەتی بەڵکوو دەربارەی خوداش ئاڕاستە و مەزهەبی جیا جیا هەیە هەروەك لە سەرەتادا لە باسی هەڵوێستی خەڵك بەرانبەر بوونی خودا باسمانکرد.

### پێویستی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بە پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەر

**یەکەم:** مرۆڤ پێویستە ملکەچ بێت بۆ خودای گەورە، هەروەك چۆن هەموو دروستکراوەکانی تر بە هەموو گەردوونەوە ملکەچی خودای

گەورەن، چونکە هەموو دروستکراوێك پێویستە شوێنکەوتەی دروستکارەکەی بێت، ملکەچ بێت بۆ فەرمان و یاساکانی، چونکە دروستکراو واتە ملکەچی تەواو بۆ دروستکار، ئینجا ئەو ملکەچییە کە بەشێکی ئەساسییە لە بوونییەتی مرۆڤ، زۆر جار تووشی کەموکوڕی و لادان دەبێت، چونکە مرۆڤ لەبیرچونەوە و بێئاگایی و شەهوەت و ئارەزووی هەیە، کەواتە پێویستی بە کەسێکە بەردەوام بیری بخاتەوە و بیگەڕێنێتەوە بۆ ڕاستە ڕێیەکە، ئەو کەوکوڕی و بێباکی و ئارەزووە کاتییە خراپەکانی تری لێ داماڵێت.

کەواتە ناشگونجێت بیرخەرەوەکە و ڕێ نیشاندەرەکە هەر لە هەمان ڕەگەز خۆی بێت کە دووبارە سەرچاوەی کەموکوڕییە، بەڵکوو دەبێت لە خالیقەوە سەرچاوە بگرێت، کە زانست و حیکمەت و توانای ڕەهای هەیە و لە فیترەت و عەقڵ و بیر و هۆش و نەفس و ڕووحی مرۆڤ بەتەواوی شارەزایە.

**دووەم:** زۆر بابەت هەیە عەقڵی مرۆڤ پێیاننا‌گات، یان زۆریان بەتەواوی لێیان تێناگات، بۆنموونە:

* جیهانی پەنهان ( عالم الغيب)، جیهانی پەنهان شتێکە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت پێی بگات مەگەر لەڕێی پێغەمبەرەوە بێت، کە ئەو پێغەمبەرە پەیوەندییە لە نێوان خودا (دروستکاری گەردوون و مرۆڤ) لەگەڵ مرۆڤ، کەواتە بۆ تێگەیشتن لەو جیهانە پێویستە پێغەمبەرایەتی هەبێت.

* پەرستشەکان، باشە کە تۆ بڕوات بە خودا هێنا ئینجا ویستت پەیوەندی لەگەڵدا ببەستی، چۆن و چی دەکەی، چۆن پەیوەندیەکە دەبەستی؟ کەواتە لێرەدا دەبێت پەیوەندییێك هەبێت لە نێوان خالیق و مەخلوقدا، تاوەکوو فێربکرێت و ڕێی نیشان بدرێت کە چۆن پەرستشەکان بکات و چۆن پەیوەندی ببەستێت.

بۆنموونە ئەگەر وانەبێت چۆن بزانرێت نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات و... هتد هەن؟!

ڕەنگە یەکێك بڵێت: «جا باشە ئەوانە کوا پێویستن؟!»

بۆ ئەم وەڵامە بگەڕێوە فەلسەفەکانی نوێژ و ڕۆژ و...

* ناسینی خودای گەورە، باشە ئەگەر پێغەمبەرایەتی نەبێت و پەیوەندێیك نەبێت کە پێت بڵێ خودا ناو و سیفەتی چۆنە، تۆ چۆن دەگەی بەو بابەتە ورد و قووڵانە؟!!!

* ڕەوشت، وایە هەندێك ڕەوشت زگماکین، بەڵام هەمووشیان نا. کەواتە پێویستە پاڵنەرێك هەبێت بۆ:

* ناساندنی ڕەوشتە جوان و ناشیرینەکان بەبێ خاترانەگرتن.

* تەواوکاری ڕەوشتەکان.

* هاندان لەسەریان.

* بەردەوامی و لانەدان لێیان.

* خاڵێکی تر، ڕونکردنەوەی ڕۆژی زیندووبوونەوە و حیساب و کیتاب و لێپێچینەوە.

هەروەها وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە:

لە کوێ هاتووم؟

بۆچی هاتووم؟

بۆ کوێ دەچم؟

کێ خاوەنمەوە؟

لەگەڵ پرسیارە وجودیەکانی تر...

**سێیەم:** ئەگەر خەڵك پشتگوێ خرابان، بەدوای هەواو نەفس و ئارەزوو دەکەوتن، ئەوکات هیچ شتێکیان لێ نەدەگیرا.

**چوارەم:** مرۆڤ بە سروشتی خۆی پێویستی بە هاندان هەیە، بۆنموونە پێغەمبەران کە هاتوون حەتمەن لە بەرانبەر کارە چاکەکاندا پاداشتیان پێ ڕاگەیاندوون و لەبەرانبەر کارە خراپەکاندا سزا. دیارە ئەمەش هۆکار و پاڵنەرێکی زۆر باشە بۆ پاڵنان بە مرۆڤەوە بەرەو کارە باشەکان و دوورخستنەوەیان لە کارە خراپەکان.

**پێنجەم:** مرۆڤ بە سروشتی خۆی پێویستی بە ڕابەر و سیمبول و پێشەوا هەیە، کەواتە دەبێت پێشەوایانێك هەبن کە پێشەوایەتی خەڵك بکەن و ببنە پێشڕەوییان، ئەگەرنا خەڵکی زاڵم و خراپەکار و بەدکار دەبێتە پێشەوا و پێشڕەویان.

**شەشەم:** چەسپاندنی بەڵگەی خودا لەسەر مرۆڤایەتی، باشە ئەگەر پێغەمبەران نەهاتبان، چۆن بەڵگە لەسەر مرۆڤایەتی دەچەسپا؟!!!

**حەوتەم:** گەیاندنی پەیامی خودایی، باشە ئەگەر پێغەمبەران نەبووبان، چۆن پەیامی خودایی بە مرۆڤایەتی دەگەیەنرا ؟!!!

حەتمەن دەبێت گەیەنەرەکە لە ڕەگەزی پێگەیەنراو بێت. مادام پەیامەکە بۆ مرۆڤە، دەبێت مرۆڤیش بیگەیەنێت و تێیانبگەیەنێت و پێیانبگەیەنێت.

**هەشتەم:** ڕوونکردنەوەی پەیامی خودایی، حەتمەن هەر دەقێك یان یاسایەك یان ڕێنماییەك کە دێت پێویستی بە ڕونکردنەوە هەیە. باشە ئەگەر پێغەمبەران نەبن، چۆن بەشێکی زۆری ئەو پەیامە ڕووندەکرێتەوە، بۆنموونە لە قورئاندا کاتێك باسی نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات و هتد دەکات، زۆر بەکورتی باسی دەکات، حەتمەن دەبێت کەسێك هەبێت ئەوانە ڕوونبکاتەوە.

**نۆیەم:** فێرکردن و تەزکیە، پێغەمبەران کاری سەرەکیان فێرکردن و تەزکیەیە، حەتمەن مرۆڤایەتی هەتا پێش بکەوێت زیاتر پێویستی بە فێرکردن و تەزکیەیە.

تەزکیە دوو واتای هەیە:

١. پاککردنەوە و پاکبوونەوە

٢. گەشەپێدان و گەشەسەندن




بەم پێیەش تەزکیە واتە پاککردنەوە و گەشەپێدانی نەفس.

تەزکیەی نەفسیش واتە:

*ڕزگارکردن و پاککردنەوەی هەر نۆ ئەندامە سەرەکیەکەی مرۆڤ: مێشك، دەم، چاو، گوێ، دڵ، دەست، گەدە، دامێن و قاچ لە خراپە و شتە پیس و زیانبەخشەکان.

* گەشەپێدان بە ڕاهێنانی: مێشك، دەم، چاو، گوێ، دڵ، دەست، گەدە، دامێن و قاچ لەسەر چاکە و شتە پاك و بەسوودەکان.

بە پرۆسەی تەزکیە، هەم مرۆڤ پاك دەبێتەوە و هەم بەرەکەتیش دەکەوێتە ژیانی و گەشەدەسێنێت.

* کەواتە دەتوانین بڵێین تەزکیە دووشتە:

١. خۆدارنین و خۆخاڵی کردن (التخلیة)، واتە خۆدارنین لە هەموو سیفەتە ناشیرن و خرپەکان لە ناوەوە و لە دەرەوە، هەم دڵ و دەرون و مێشك هەم ئەندامە دیارەکانی تر.

٢. خۆڕازاندنەوە (التحلیة) واتە خۆڕازاندوە بە هەموو سیفەتە جوان و باشەکان لە ناوەوە و لە دەرەوە، هەم دڵ و دەروون و بیر و عەقڵ، هەم ئەندامە دیارەکانی تر.

کەواتە مرۆڤ بە هەموو پێوەرەکان پێویستی بە ڕێنموونی و ڕێنیشاندەر، پاڵنەر، ترسێنەر،ئاگادارکەرەوە، فێرکار، پاککەرەوە و... هتد هەیە، دیارە ئەمانەش بەبێ پەیوەندییێك لە نیوان و خودا و

مرۆڤدا ناکرێت و دروست نابێت. ئەم پەیوەندیەش پێغەمبەرایەتییە کە بریتییە لە خاڵی پەیوەندی نێوان خودا و مرۆڤ.

## سەرمەشقی و پێشەوایەتی محمد (دروودی خودای لەسەر بێت.)

((لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً)).[1] واتە: ((بەڕاستی لە پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێت.) بۆ ئێوە هەیە باشترین و چاکترین سەرمەشقی پێشەوایەتی و نموونەی تەواو و جوان بەتایبەت بۆ ئەوکەسانەی ڕەزامەندی خودایان لا مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە و زۆر یادی خودا دەکەن و زمانیان پاراوە بە ناوی ئەو.))

ئەو ئایەتە قورئانییە پەیوەستە بە گەورەترین و بەرزترین مرۆڤ، کە پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێت.) ئاماژە بەوە دەکات کە ئێمە لە هەر بوارێك بمانەوێت سەرمەشق و پێشەوا و نموونەی تەواو و جوانمان هەیە، کە پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێت.)، بەتایبەتتر ئەوانەی ڕەزامەندی خودایان لا مەبەستە و دەیانەوێت خودا لە خۆیان ڕازی بکەن و لە قیامەتدا سەرفراز بن. کەواتە هەرکەسێك دەیەوێت خودا لە خۆی ڕازی بکات، سەرفرازی دونیا و قیامەت بێت، با پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) بکاتە سەرمەشق و پێشەوای خۆی.

---

(١) [الاحزاب: ٢١].

**ئێمە لە هەر بوارێك بڕوانینە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) پەكمان ناكەوێت، چونكە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.):**

١- بێباوك بووە و سۆزی باوكی نەبینیوە كەواتە بۆ بێباوكان سەرمەشقە.

٢- زۆر زوو و هەر بە منداڵی دایكیشی وەفاتی كردووە و بێبەش بووە لە سۆزی دایكیشی، كەواتە بۆ بێدایكانیش سەرمەشقە.

٣- شوان بووە، كەواتە بۆ شوانانیش سەر مەشقە.

٤- كاری بازرگانیشی كردووە، كەواتە بۆ بازرگانان و كاسبكارانیش سەر مەشقە.

٥- خێزاندار و هاوسەر بووە، كەواتە بۆ خێزانداران و هاوسەرانیش سەرمەشقە.

٦- باوك بووە، كەواتە بۆ باوكانیش سەرمەشقە.

٧- باپیر بووە، كەواتە بۆ باپیرانیش سەرمەشقە.

٨- هەژاریی بینیووە، كەواتە بۆ هەژارانیش سەر مەشقە.

٩- دەوڵەمەندیی بینیوە، كەواتە بۆ دەوڵەمەندانیش سەرمەشقە.

١٠- ستەملێكراو بووە، كەواتە بۆ ستەملێكراوانیش سەر مەشقە.

١١- ئازاردراو و ئەشكەنجەدراو بووە، كەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

١٢- سوکایەتیپێکراو و گاڵتەپێکراو بووە، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

١٣- بوختانبۆکراو بووە، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

١٤- دەرکراو و دەربەدەر بووە، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

١٥- هیجرەتکار بووە و هیجرەتی کردووە لە زێدی خۆی، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

١٦- پێشەواو قائیدی سوپا بووە، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە

١٧- سیاسی و بەڕێوەبەر و دەوڵەتدار بووە، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

١٨- خواناس و زاهید و عابید بووە، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

١٩- بێفیز و تەکەبوور بووە سەرەڕای ئەو هەموو دەستڕۆیشتوویی و دەسەڵات و گەورەییە، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

٢٠- ڕاستگۆ بووە، کەواتە بۆ ڕاستگۆیانیش سەرمەشقە.

٢١- منداڵ لەدەستدراو بووە، کەواتە بۆ ئەوانیش سەرمەشقە.

هەروەها دڵسۆز و ئارامگر و تەوبەکار و متمانەبەخۆبوو و بەهیوا و ئومێد و گەشبین بووە، هەروەها پشتبەستو بەخوا و خەڵوەتکار و ملکەچ بۆ حەق و ڕاستی بووە، ئەمانەتپارێز و قوربانیدەر و پاك و خاوێن و جوان و ڕێك و پێك و سەخی و




بەبەزەیی و بەسۆز بووە، لێبووردە و دادگەر و حیکمەتدار و داوێن پاك و دەم پاك و دەست پاك بووە، نەرم و نیان و ئازاو چاونەترس و بەقەناعەت و گورج و گۆڵ و هیممەت بەرز بووە، ڕووخۆش و دەم بە خەندە و ڕق و کینەی خواردۆتەوە، بیرکەرەوە و بیر تیژ بووە، دەم بە زیکر و بەئینساف و جددی و بەڕێز بووە، ڕق لەدڵ و سنوور بەزێن و بەکەم سەیرکەر و خۆبەگەورەزان و بەئیرەیی و فێڵکار نەبووە، ئەمانە و چەندین ڕەوشتی تری بەرز لەو تاقە کەسە بەڕێزەدا هەبوونە.

ئەوانە بە شاهێدی دوژمنەکانیشی بوونیان هەبووە لەو پێغەمبەرە مەزنەدا.

کەواتە هەرخۆی شایەنی پێشەوایەتی و پێشەنگبوون و سەرمەشق و ئیمامەتییە.

## ڕۆژی دوایی

یەکێکی دیکە لە بنەماکانی ئیمان و بیروباوەڕی ئیسلامی بریتییە لە باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی و هەموو ئەو ڕووداوانەی تێیدا ڕوودەدەن، ئەو ڕۆژەی هەموو کەسێك زیندوو دەکرێتەوە و حەقی خۆی وەردەگرێت.

هەموو نەفسێك دەمرێت

(كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ) آل عمران ١٨٥.

واتە: هەموو کەسێك دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت.

ئەگەر بڕوانین ئایەتەکە دەفەرموێت: هەموو نەفسێك دەمرێت، نەیفەرمووە هەموو ڕووحێك دەمرێت، چونکە ڕووح نامرێت، ڕووح بە نەمری دەمێنێتەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

(ولَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ). آل عمران ( ١٦٩ )

هەرگیز وامەزانن و وادامەنێن ئەوانەی لەپێناوی خوادا شەهید بوون و کوژران، مردوون، نەخێر وانیە، بەڵکو ئەوانە زیندوون، لای پەروەردگاریان لە ڕزق و ڕۆزیی (هەمە جۆر و تایبەت) بەهرەوەرن.

(فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ). آل عمران ( ١٧٠ )

زۆر دڵخۆش و شادمانن بەو بەخشش و زیادە فەزڵەی کە خوا پێی بەخشیوون، مژدەش دەدەن بەوانەی هێشتا بەوان نەگەیشتوون و (شەهید نەبوون) کە بێگومان هیچ ترس و بیمێکیان لەسەر نییە، هیچ غەم و پەژارەیەکتان بۆ پێش نایەت (لە بەجێ هێشتنی دنیا).

(يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ). آل عمران ( ١٧١ )

مژدە دەدەن بەناز و نیعمەتانی تایبەتی و فەزڵ و ڕێزی بێ سنوور لەلایەن خوای میهرەبانەوە، بەڕاستی خوایش پاداشتی ئیماندارا‌ن زایە ناکات و (ڕەنج بەخەسار نابن).

## ژیـانی بـەرزەخ :

بەرزەخ لەڕووی زمانەوانیەوە واتە: بەربەستی نێوان دوو شت، یان پەردە.

لەڕووی شەرعیەوە واتە: ژیانی دوای مردن تاوەکو ڕۆژی زیندوبوونەوە و قیامەت.

خوای گەورە دەربارەی ژیانی بەرزەخ دەفەرموێت:

(حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ). المؤمنون ( ٩٩ )

(خوا نەناسان بەردەوام لەسەر ڕێبازی چەوتیانن)، هەتا ئەو کاتەی مردن یەخەیان دەگرێت، ئەوسا هەریەکەیان دەڵێت: پەروەردگارا بمگێڕەرەوە بۆ دنیا...

(لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ). المؤمنون ( ١٠٠ )

بەڵکو چاکە ئەنجام بدەم و کاری باشە بکەم و ئەو هەڵانەی کە لە دەستم چووە لەمەودوا لەدەستی نەدەم، (بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە، شتی وا مەحاڵە، بۆیە بە توندی پێی دەوترێت): نەخێر، ئەوە قسەیەکە ئەو بۆ خۆی دەیلێت، بەڵکو دەبێت لە جیهانی بەرزەخدا، لە نێوان مردن و زیندووبوونەوەدا تا کاتێك زیندوو دەکرێنەوە چاوەڕێ بێت.

لەم ژیانەدا کە ژیانی بەرزەخە و دەکەوێتە نێوان مردن و ڕۆژی قیامەت مرۆڤی ئیماندار و مرۆڤی بێباوەڕ، مرۆڤی باش و مرۆڤی خراپ حاڵیان جیاوازە، وردەکارییەکەی لە فەرموودەکاندا ڕوونکراوەتەوە، بەڵام ئەگەر بمانەوێت وێناکردنەکەی نزیك بکەینەوە، دەتوانین بیچوێنین بە خەون، مرۆڤ جاری وا هەیە خەونێکی زۆر ناخۆش دەبینێت، بۆنموونە لە شاخێك دەیخەنە خوارەوە، یان خەونێکی زۆر خۆش دەبینێت و تام و چێژی زۆری لێ دەبینێت، بۆنموونە لە باغ و باغات و باخچەیەکی زۆر دڵگیر و خۆشدایە، یان ...، بەڵام کە هەڵدەستێت لە شوێنی خۆیەتی و هیچ شتێك نەگۆڕاوە و جەستە و ... وەك خۆیەتی و هیچ شتێکی بەرجەستە ڕووی نەداوە، کەواتە ئەو مردووەی دەیبینی




و هیچ شتێکی بەسەرەوە دیار نییە، وەك كەسە خەوتووەکەیە و ڕووحەکەی خۆشی و ئازار دەچێژێت.

مردن تەنها گواستنەوەیە

مردن گواستنەوەیە لەم دونیا بۆ ئەو دونیا.

مردن کۆتایی نییە، بەڵکو دەستپێکی ژیانێکی نوێیە.

مردن لە ئیماندا بریتییە لە ژیان، چونکە لەوێوە ژیان دەست پێدەکات.

مردن بریتییە لە نەمری، بۆیە دەوترێت: «گەیشتە کاروانی نەمران»، مردن بارگە و بنە دەپێچێتەوە، بۆیە ئێستا هەموومان مردووین چونکە مردنمان لە پێشە، بەڵام کە مردین ژیانی هەتاهەتاییمان لەپێشە و جارێکی تر مردن نابینینەوە.

مردن بریتیە لە وەزیفە گۆڕان لە دونیا بۆ ئەو دیو دونیا، وەك مامۆستا سەعیدی نورسی دەفەرمووێت: «مردن تەنها و تەنها وەزیفە گۆڕانە لێرە بۆ ئەو دیو.»

مردن بریتییە لە هیوا، مردن لە ئیماندا هیوایە بە داهاتوییێکی ڕوون.

بریتییە لە بەختەوەری ...

بریتییە لە حەسانەوە ...

مردن بریتییە لە گەیشتن بە خۆشەویستان، شەوێك گفوگۆییێکی هێمنانەم لەگەڵ بێباوەڕێك کرد دەیوت: «ئاااای بریا زیندوبونەوە

هەبووایە، تاوەکوو خوشکە بچوکەکەم بینیبایەوە کە بە بچووکی مردووە!!!»

مردن بریتییە لە بینینی پەروەردگار و دروستکاری خۆت و هەموو بوون و گەردوون. بریتییە لە:

کۆتایی ناخۆشییەکان

کۆتایی نەخۆشییەکان

کۆتایی کێشەکان

کۆتایی پیسییەکان

کۆتایی بێئومێدی

کۆتایی خود بزری

کۆتایی پیری

کۆتایی خیانەت

کۆتایی درۆ

کۆتایی فێڵ

کۆتایی دووڕوویی

کۆتایی خۆبەگەورەزانی

کۆتایی سەرسامبوون

کۆتایی ڕق

کۆتایی زوڵم و ستەم

کۆتایی غەیبەت

کۆتایی زمان پیسی

کۆتایی گومان بردنی خراپ

کۆتایی جاسوسی

کۆتایی تۆڵە سەندنەوە

کۆتایی گاڵتەکردن بەیەك

کۆتایی خۆپەرستی

کۆتایی ئازار

کۆتایی ...

بەڵام مردن لە ناباوەڕیدا، واتە کۆتایی هەموو شتەکان و کۆتایی ژیان، واتە یەك پارچە تارمایی.

بێباوەڕی وا لە مرۆڤ دەکات بێهیوا ببێت لە هەموو شتێك، چونکە ئەو هیوای تەنیا لەسەر چەند ساتێك و کاتێك هەڵچنیوە و بیر لە شتێکی تر ناکاتەوە، بڕوای بە دوارۆژ و زیندوبوونەوە نییە، تۆزێك ناخۆشی تووش ببێت بەرگەی ناگرێت و بێئومێد وبێهیوا دەبێت لە ژیاندا، بەڵام کەسی باوەڕدار هەرچەند تووشی ناخۆشی و نەخۆشی ببێت هیوا و ئومێدی زۆری بە

خودا و دوارۆژ و قەرەبووی قیامەت هەیە، بە ئومێدەوە لە ژیان دەڕوانێت و بێهیوا نابێت لە ژیان و خودا و دوارۆژ.

بۆیە فەیلەسوفی ئەڵمانی مولحید «نیچە» دەڵێت: «ژیان هەمووی وێنەیەکە لە بەدبەختی وموعانات و ناخۆشی و ماڵوێرانی.»

هەروەها دەڵێت: «من باش دەزانم بۆیە مرۆڤ پێدەکەنێت لەناو هەموو زیندەوەراندا، چونکە هەر ئەوە ناخۆشی و بەدبەختی دەچێژێت، بۆیە ناچار بووە لای خۆیەوە پێکەنین دابهێنێت تاوەکوو دڵی خۆی خۆش بکات.»

کەواتە ئەو ئەوەندە بەبێهیوایی و بێئومێدی لە دونیا دەڕوانێت هەتا گەیشتووە بەوەی بڵێت: پێکەنینیش دەست کردی مرۆڤە و لە ناچاری دایهێناوە.

هەروەها فەیلەسوفی ئینگلیزی «هربرت سبنسر» کۆتایی بە پەرتووکی (المبادئى الأولى) بە ڕستەیەك دێنێت و دەڵێت: «ژیان پڕوپووچ و بێمانایە و شایەنی مانەوە نییە.»

هەروەها فەیلەسوفی ناباوەڕ «شۆپنهاوەر» پێیوایە خۆشییەکانی دونیا هەموویان پڕوپووچن و دونیا بە هەموویەوە کە هەوڵی بۆ دەدرێت بێهودەیە و جێی هیوا و ئومێد نییە.

هەروەها فەیلەسوفی ناباوەڕ «سارتەر» پێیوایە بوون هەمووی لە چوارچێوەی قەلەقی، ئازار، نەهامەتی، ناخۆشی، ماندوویی، بێهودەیی، بێهیوایی دەسووڕێتەوە.

بینیتان چۆن ناباوەڕی مرۆڤ سووك و بێئامانج و بێهیوا و بێئومێد دەكات، یەكسانی دەكات بە ئاژەڵێكی بێئامانج و بێهیوا.

بەڵام لە تێڕوانینی باوەڕدا، مرۆڤ ئامانجدارە و بەهیوا و بەڕێز و خۆشبەخت و گەشبینە.

بابەتی بێهودەیی و بێ ئامانجی و بێئومێدی لە ناباوەڕیدا و خۆشبەختی و ئەمەل و گەشبینی و هیواو ئومێد لە بازنەی باوەڕدا زۆر زۆری دەوێت، ئەگەر بە هەزاران لاپەڕە و بە سەدان پەرتووكی لەسەر بنووسرێت، هێشتا هەر كەمە؛ بەڵام ئێمە بە ئەوەندە كۆتایی پێ دێنین لەبەر درێژ نەبوونەوەی بابەتەكە.

ئامانج و مەبەست لە ژیاندا بوونی نیە بە تێڕوانینی ناباوەڕی، چونكە خاوەنت نییە، ئایینت نییە، ڕەوشت بوونی نییە و ڕێژەییە، ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە نییە و درۆیە، كە مردیت كۆتایت پێ دێت و چۆن لە نەبووەوە هاتووی ئاواش دەبییەوە نەبوو، بوونێكی ترت نییە، كەواتە ئامانج و مەبەستیش بوونی نییە، چۆن ژیان بەڕێوەدەبەی ببە، وەك هەر درووستكراوێكی تر لە گەردوون، چونكە سەرچاوەی هەموویان سروشت و ماددەیە و سروشت و مادەش ئامانج و مەبەستییان نییە.

بۆیە «بێرتراند ڕاسل» جەخت لەسەر بیری بێئامانجی و نەبوونی مەبەست (عدمیة) دەكاتەوە و دەڵێت: «ژیان بێواتایە و هیچ داناییەكی لەپشتەوە نییە.»

هەروەها بێباوەڕە نوێیەکانیش وەکوو «ڕیچارد داوکینز» جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە و دەڵێت: «ژیان بێ دیزاین و بێئامانجە، خاڵییە لە چاکە و خراپە، جگە لە گوێنەدان بە ئازار هیچی تر بوونی نییە.»

لە شوێنێکی تردا «داوکینز» دەڵێت: «ئێمە ئامێرێکین لە لایەن (DNA)یەوە درووستکراوین، ئامانجیشمان کۆپیکردنەوەی زیاتری هەمان (DNA) یەکەیە.

هەروەها دەڵێت: «پرسیاری ئەوەی ‹بۆچی ئێمە لێرەین؟› پرسیارێکی پووچ و بێمانایە، چونکە هیچ مەبەستێك لە دروستکردنی مرۆڤدا نییە، هەروەکوو پرسیاری دروست بوونی شاخەکان وایە.»

هەروەها فەیلەسوفی مولحید «کوینتن سمیث» دەڵێت: «ئێمە لە هیچەوە هاتووین، بەبێ هیچ، لەپێناو هیچ.»

هەربۆیەشە ڕێژەی خۆکوشتن لە ناو ئەم جۆرە کەسانە زۆر زۆرە چونکە ئەمانە ئەوە تێڕوانینیانە بۆ ژیان. کەسێکیش وا بیربکاتەوە، زۆر لای ئاساییە خۆی بکوژێت، چونکە پێی وایە بوون و نەبوونی یەکسانە. بۆیە دەبینین کاتێك لە مردن نزیك دەبنەوە گوزارشت لە نائامانجداری و نەبوونی مەبەست ( اللاغائية والعدمية ) دەکەنەوە و بە ئەسەفەوە گوزارشت لەو بێئامانجییە دەکەنەوە.

«ڤۆڵتێر» هاواری دەکرد: «چ سەرەنجامێکی خراپە، لە نەبوونی و بێئامانجی و عەدەمدا فەنابم.»

هەروەها ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی (Septimius Severus)

«سێپتیمیس سێڤێرس» بە چپەوە دەیگوت: «من هەموو شتێك بووم.»

هەروەها فەیلەسوف و سیاسەتمەداری ئەمریکی Tomas Paine))

«تۆماس پەین» دەیگوت: «ئامادەم هەموو بوون بکەمە قوربانی، ئەگەر من بە تەنیا ڕووبەڕووی دۆزەخ ببمەوە.»

هەروەها فەیلەسوف »تۆماس کارلایك» دەیگوت: «من تەنیا مرۆڤێکی پیری بێتوانام کە خەریکم لە سەرەنجامێکی نادیار نزیك دەبمەوە.»

هەروەها »سێر فرانسیس نیوپۆرت»، دەیگوت: «هەموو شتێك کۆتایی هات.»

هەروەها « تۆماس هۆبز»، دەیگوت: «من نزیکم لەوەی دوایین هەنگا و بەرەو تاریکی بنێم.»

هەروەها «کۆنت میرابۆ» لە سەرەمەرگیدا هاواری دەکرد: «مۆرفینێکم بدەنێ، من ناتوانم بیر لە نەبوو بکەمەوە.»

بۆیە زانای لاهوتی قەشە «ئۆگستین» و زانا و فیزیازان و پیاوی ئایینی فەرەنسی پاسکاڵ وەسفی چارەسەرەکەیان کردووە کاتێك گوتوویانە: «تەنیا لەگەڵ خودا لە ئارامیداین.»[١]

---

(١) بۆ ئەم وتانە بڕوانە: كواشف زيوف في المذاهب الفكرية المعاصرة.

کەواتە مردن لە ئیماندا واتە ژیان و ئومێد و هیوا، بەڵام لە ناباوەڕیدا واتە مردنی هەتاهەتایی و فەنابوونی یەکجاری و بێهیوایی و بێئومێدی و تارمایی.

ژیان لای باوەڕدار ژیانە، مردنیش هەر ژیانە، بەڵام ژیان لای بێباوەڕ مردنە، مردنیش هەر مردنە!

---

عبدالرحمن حسن حبنكة الميداني، (٥٥٩-٥٦٢)، هەروەها: ئیلحاد گرفتێکی دەروونییە، أ. د. عمر شریف، وەرگێڕانی مزەفەر عەوڵا قەسرێ (١٨٣).

# نیشانەکانی ڕۆژ دوایی

نیشانەکانی ڕۆژی دوایی دوو جۆرن:

نیشانە بچووکەکان

نیشانە گەورەکان

هەر یەکێکیش لەمانە بەڵگەی خۆی لەسەرە، بەتایبەت لە فەرمووددا، ئەوەی مەبەستی بێت، کتێبی تایبەت نووسراوە لەم بارەیەوە، بە کوردی و بە عەرەبی.

## فووکردن بە کەڕەنادا (الصور)

کۆتایی جیهان و ژیان و دەستپێکی زیندووبوونەوە بە فوو دەستپێدەکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

(وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ) الزمر ( ٦٨ )

لەو ڕۆژەدا فوو دەکرێت بە - صور - دا، (مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت چ دەزگایەکە) هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا مابێت خێرا دەمرێت، مەگەر کەسێك خوا ویستی لەسەر مردنی نە بێت، لەوەودوا فوویەکی تری پیادا دەکرێتەوە، جا دەستبەجێ هەرهەموو خەڵکی هەستاونەتە سەرپێ و بەسەرسامیەوە چاوەڕوانن.

(وَأَشْرَقَتِ الْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ الْكِتَابُ وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ). الزمر ( ٦٩ )

واتە: دیارە کە خۆری دونیا نەماوە، زەوی بۆتە گۆڕەپانێکی فراوان) ئەوسا بەنوورێك کە خوا فەراهەمی دەهێنێت زەوی ڕوناك دەبێتەوە، کارنامە و دۆسیەکانیش دانراون، سەرەتا پێغەمبەران و شەهیدان دەهێنرێن و دادوەری لە نێوانیاندا ئەنجام دەدرێت بەشێوەیەکی حەق و ڕاستی، بێگومان ئەوان هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت.

### فووی یەکەم

(وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ وَكُلٌّ أَتَوْهُ دَاخِرِينَ). النمل ( ٨٧ )

واتە: یادی ڕۆژێك بکە فوو دەکرێت بە _صور_ دا، هەرکەس لە ئاسمانەکان و هەرکەس لە زەویدا هەیە، ترس و بیمێکی زۆر دایدەگرێت، جگە لەوانەی کە ویستی خوا وایە ترس و بیمیان، هەمووانیش دێن بە ملکەچێ و ناچاریی.

(وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ). الزمر ( ٦٨ )

واتە: لەو ڕۆژەدا فوو دەکرێت بە - صور - دا، (مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت چ دەزگایەکە) هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا مابێت خێرا دەمرێت، مەگەر کەسێك خوا ویستی لەسەر مردنی

نە بێت، لەوەودوا فوویەکی تری پیادا دەکرێتەوە، جا دەستبەجێ هەرهەموو خەڵکی هەستاونەتە سەرپێ و بەسەرسامیەوە چاوەڕوانن.

## فووی دووەم

(وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا). الكهف ( ٩٩ )

واتە: لەو ڕۆژە بەدواوە وازمان لێهێنان تا وەك شەپۆل بەناو یەکدا بێن، یاخود وازمان لێهێنان بۆ ئەو ڕۆژەی (کە بەربەستەکە دەشکێت و بە پەلە) وەکو لێشاودێنە دەرێ و شەپۆل دەدەن بەناو یەکدا (کە یەکێکە لە نیشانەکانی کۆتایی هاتنی دونیا)، ئەوسا فوو دەکرێت بە - صور - دا، بەو هۆیەوە هەر هەموو خەڵکی بە تەواوی کۆ دەکەینەوە (بۆ موحاسەبە و لێپرسینەوە).

(وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ).يس (٥١)

واتە: پاشان هەر کە فوو دەکرێت بە- صور- دا، دەستبەجێ خێرا هەموویان لە گۆڕەکانیان لە توێی خاکەوە بەپەلە دێنە دەرەوە بۆ لای پەروەردگاریان (کەس ناتوانێت سەرپێچی بکات، یان خۆی بدزێتەوە)

(يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا). النبأ ( ١٨ )

واتە: ئەو ڕۆژەی کە فوو دەکرێت بە (صور) دا، جا پۆل پۆل و دەستە دەستە بەرەو مەیدانی لێپرسینەوە بێ پەروا دێن

(يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا). طه (١٠٢)

واتە: ڕۆژێك دێت فوو دەكرێت بە - صور- دا، ئەو ڕۆژە تاوانباران چاویان كوێرەو شین هەڵگەڕاوە (دیمەنێكی ناشرین و سامناكیان هەیە).

## زیندوكردنەوە (البعث)

ڕۆژی دوایی بە زیندووكرنەوە دەستپێدەكات، كە بریتییە لە زیندووكردنەوەی مردووەكان لەلایەن خوای گەورەوە، واتە جارێكیتر جەستەیان پێكدەهێنێت و درووستیان دەكاتەوە.

(وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَا يَبْعَثُ اللَّهُ مَن يَمُوتُ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ). النحل ( ٣٨ )

واتە: بێ باوەڕان سوێندیان دەخوارد و جەختیان لەسەر سوێندەكەیان دەكرد و دەیانوت: ئەوەی بمرێت خوا زیندووی ناكاتەوە! نەخێر، زیندووی دەكاتەوە، ئەوە بەڵێنێكی ڕاست و دروستی خوایە و لێی پاشگەز نابێتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵكی ئەم ڕاستیە نازانن و بڕوای پێناكەن.

(لِيُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ). النحل ( ٣٩ )

واتە: بێگومان خوا هەمووان زیندوو دەكاتەوە تا بۆیان ڕوون بكاتەوە و بۆیان دەربخات، ئەوەی ئەوان كێشەیان لەسەری

هەبوو، بڕوایان پێی نەبوو هاتە دی، تا ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون بێگومان ئەوان درۆزن بوون.

(إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَن نَّقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ). النحل (٤٠)

واتە: بەڕاستی کاتێك زیندوو کردنەوە و بەدیهێنانی هەر شتێکمان بوێت، تەنها ئەوەندەی دەوێت پێی بڵێین ببە! دەستبەجێ ئەویش دەبێت.

## حـەشـر (کۆکردنەوە)

دوای زیندووکردنەوە دەستدەکرێت بە حەشرکردن (کۆکردنەوە) و لێپرسینەوەی خەڵکی، لە جێگایەکدا کۆدەکرێنەوە بۆ حیساب و دادگایی و یەکلاکردنەوەی بارودۆخی بەندەکان.

(يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَٰنِ وَفْدًا). مريم ( ٨٥ )

واتە: ڕۆژێك دێت ئێمە دەستە دەستە خواناس و پارێزکاران بۆ لای خوای میهرەبان کۆدەکەینەوە و بە ڕێ دەکەین (تا بەدیداری شادبن و بیانخاتە بەهەشتەوە).

(وَنَسُوقُ الْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا). مريم ( ٨٦ )

واتە: تاوانبار و گوناهکارانیش بەپەلە و بەتینویەتی ڕابێچ دەکەین بۆ ناو دۆزەخ.

## خستنەڕووی کردەوەکان

لە ڕۆژی دواییدا و دوای زیندووبوونەوە مرۆڤ و کردەوەکانی دەخرێنەڕوو، ورد و درشتی کار و کردەوە و کردار و گوفتار و باشە و خراپە دەخرێنەڕوو و هەموو کەسێك کار و کردەوە و کردار و گوفتارەکانی خۆی دەبینێت.

(يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ). الحاقة ( ١٨ )

واتە: لەو ڕۆژەدا پیشان دەدرێن، هیچ شتێك لە نهێنیەکانتان شاراوە نیە

(يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ). الزلزلة ( ٦ )

واتە: ئەو ڕۆژە خەڵکی دەستە دەستە بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوە دەردەچن، بەپەرش و بڵاوی، تا کار و کردەوەکانیان ببیننەوە (دیارە کە نامەی کردەوەکان تۆمار کراوە بە دەنگ و ڕەنگەوە).

(فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ). الزلزلة ( ٧ )

واتە: جا ئەوەی بە قەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێر و چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە.

(وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ) الزلزلة ( ٨ )

واتە: ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕ و خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە.

## حیساب و لێپرسینەوە

حیساب و لێپرسینەوە دوو جۆرە لە ڕۆژی دواییدا:

١- حیساب ولێپرسینەوەی سوك و ئاسان، کە بریتییە لە پیشاندان، کە تایبەتە بەو باوەڕدارانە کە دەربازیان بووە، ئەوەش بە پیشاندانی کارەکانیان واتە باوەڕداران ئەو کردەوانەی کە لە دونیادا کردوویانە پیشانیان دەدرێت، پێیان دەگوترێت ئەوە تاوانەکەتە و چاکەکانیشیان بیردەهێندرێتەوە، پاشان لێیان خۆشدەبن.

٢- حیساب ولێپرسینەوەی قورس و گران، بریتییە لە لێپرسینەوەی توند و گفتوگۆ و وردبوونەوە لە هەموو کارێکی گەورە و بچوك، لە هەموو نیعمەتێکی کەم و زۆر، ئەو جۆرە حیساب و لێپرسینەوەیە بۆ بێباوەڕ و دووڕو و خراپەکارانە.

بەڵگە لەسەر وردی و دەقیقی حیساب و لێپرسینەوە

### أ- شاهێد و گەواهیدەر

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوپەڕی دادوەری خوای گەورە کە شاهێد دەهێنێت بۆ سەرتاوانباران بەر لەوەی سزایان بدات سەرەڕای ئەوەی کە بۆ خۆی دەزانێت کە ئەوانە تاوانبارن.

ئەو شاهێدانەش بریتین لە:

١- پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام): شاهێدی دەدەن لەسەر ئوممەتەکانیان بەوەی کەوا دین و پەیامی خوای گەورەیان پێراگەیاندوون و بیانوویان بۆ نەهێشتونەتەوە[١].

٢- فریشتەکان: ئەوانەی کە کردەوەکانیان تۆمارکردوون و تاوانەکانیان بینیون[٢].

٣- شاهێدیدانی زەوی: لە گۆڕەپانی حەشردا زەوی شاهێدی دەدات لەسەر هەموو دروستکروەکان لە بارەی ئەو کردەوانەی کردوویانە لەسەر ڕووی زەوی لە چاکە و خراپە[٣].

٤- ئەندامەکانی لەش: هەروەکو چۆن زەوی گەواهی و شاهێدی لەسەر خەڵکی دەدات، بەهەمان شێوەش زمان و دەست و لاق و گوێ و چاو و پێستی مرۆڤیش شاهێدی لەسەر خاوەنەکانیان دەدەن کاتێك دەڵێن شاهێدمان تەنها لە خودی خۆمان دەوێت[٤].

### ب- پێدان و بڵاوکردنەوەی کتێبی کردەوە و وەرگرتنەوەی

لەگۆڕەپانی حەشردا هەموو کەسێك کتێبی کردەوەکانی پێدەدرێتەوە وەریدەگرێتەوە، کە ئاماری هەموو کردەوە باش و

---

(١) سورة النحل: ٨٤.

(٢) ق: ٢١.

(٣) الزلزلة: ٤. وفی حدیث رواه الإمام أحمد: ٣٧٤. والترمذی: ٢٤٢٩.

(٤) یس: ٦٥. والنور: ٢٤.

خراپەکانی تێدا تۆمار کراوە لەڕێی ئەو فریشتە بەڕێزانەی کە کردەوەی مرۆڤەکان دەنوسن[١].

ئەو کتێبانەی کە کردەوەکانی تێدا تۆمار کراون، چاوپۆشی لەهیچ کارێکی بچوك و گەورە ناکات، بەڵکو هەموویان تۆمار دەکات هەر لەکاتی باڵغ بوون و پێگەیشتنەوە هەتاوەکو مردن و کۆچی دوایی[٢].

کاتێکیش مرۆڤ کتێبەکەی وەردەگرێتەوە فەرمانی پێدەکرێت کە بیخوێنێتەوە، جائەوەی خوێندەواریشی نەبووبێت لە دونیادا دەتوانێت نوسراوی خۆی بخوێنێتەوە.

## چۆن کتێبەکان وەردەگیرێنەوە؟

کتێبەکان دابەشدەکرێن بەسەر خاوەنەکانیاندا، جا باوەڕدار کتێبەکەی بەدەستی ڕاست وەردەگرێتەوە و مژدە دەدات بە سەرکەوتن[٣]، بەڵام بێباوەڕ کتێبەکەی بەدەستی چەپ وەردەگرێتەوە، یان لەپشتیەوە وەری دەگرێتەوە، دڵی تەنگ دەبێت، خەموخەفت دایدەگرێت و هاواری لێ بەرزدەبێتەوە[٤].

---

(١) الانفطار: ١٠ _ ١٢.

(٢) الكهف: ٤٩.

(٣) الحاقة: ١٩.

(٤) الحاقة: ٢٥ _ ٢٧. والانشقاق: ٧ _ ١٢.

## بارودۆخی خەڵکی لەکاتی وەرگرتنەوەی کتێبەکانیان

خەڵکی سێ کۆمەڵن لەکاتی وەرگرتنەوەی کتێبەکانیان:

**کۆمەڵەی یەکەم:** ئەوانەن کە بەدەستی ڕاستیان کتێبەکانیان وەردەگرنەوە، کە بریتیین لە مرۆڤە باوەڕدارەکان.

**کۆمەڵەی دووەم:** ئەوانەن کە بەدەستی چەپیان کتێبەکانیان وەردەگرنەوە کە بریتیین لەوانەی باوەڕیان بە خوای گەورە نەبووە، هانی خەڵکیشیان نەداوە بۆ یارمەتیدانی هەژاران، واتا: بێدین و هاوبەشدانەران (مشرك) و خۆبەگەورەزانان لە ئاست خواپەرستی، هەروەها دووڕووەکان کە بە ڕواڵەت ئیماندارن، بەڵام ناخیان بێباوەڕی و دوژمنایەتی ئیسلامی هەڵگرتووە.

**کۆمەڵەی سێیەم:** ئەوانەن کە کتێبەکانیان بە دەستی چەپ و لەدواوە (لەپشتڕا) وەردەگرنەوە، کە بریتیین لەو کەسانەی کە کتێب و پەیامی خوای گەورەیان پێگەیشتووە لە دونیا، بەڵام پشتگوێیان خستووە و فڕێیانداوەتە پشتەوە، گۆڕیویانەتەوە بە قازانج و سوودێکی کەمی دونیایی، بۆیە لە ڕۆژی دواییدا پێیان دەگوترێت کتێبەکەت لەدواوەڕا وەربگرەوە.

## ج- کێشانی کردەوەکان

لەگۆڕەپانی مەحشەردا خوای گەورە چەندین تەرازوو دادەنێت بۆ کێشانی کردەوەی بەندەکان کە لەسەری تۆمار کردوون، بۆئەوەی بە وردی پاداشتی هەموو کەسێك بداتەوە

بەپێی کارەکەی لە چاك و خراپ، هەتا ئەگەر بە ئەندازەی میسقاڵە زەرەیەکیش بێت، چونکە بەو شێوەیە دادپەروەری خودایی بەرقەراردەبێت[١].

### بارودۆخی خەڵکی لەکاتی کێشانی کردەوەکاندا:

لەکاتی کێشانی کردەوەکاندا خەڵکی سێ کۆمەڵەن:

**کۆمەڵەی یەکەم:** ئەوانەن کە کردەوەکانیان قورس و گرانن، چاکەکانیان زۆرترن لە خراپەکانیان، ئەوانە بەهەشتیەکانن[٢].

**کۆمەڵە دووەم:** ئەوانەن کە کردەوەکانیان سوکن، وە خراپەکانیان زۆرترن لە چاکەکانیان، ئەوانەش دۆزەخیەکانن[٣].

**کۆمەڵەی سێیەم:** ئەوانەن کە چاکە و خراپەکانیان بە ئەندازەی یەکن و لە یەك ئاستدان، ئەوانە پێیان دەگوترێت هاوەڵانی ئەعراف، کە سەیری بەهەشتیەکان دەکەن ئارەزوو و هیوایان هەیە کە لەگەڵ ئەوان بن، کاتێکیش سەیری دۆزەخیەکان دەکەن دڵیان دەلەرزێت و ڕادەچڵەکێت لە ترسی ئەوەی بخرێنە ناو ئەوانەوە[٤].

---

(١) الأنبياء: ٤٧.

(٢) القارعة: ٦. الأعراف: ٨.

(٣) القارعة: ٨. الأعراف: ٩.

(٤) الأعراف: ٤٦ _ ٤٧.

## باسکردنی دیمەنەکان لە قورئانەوە

(وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا). الكهف ( ٤٩ )

واتە: نامەی کردەوەی هەر کەس دادەنرێت، (ئیماندارن دڵخۆشن) بەڵام تاوانباران دەبینیت دڵە لەرزێ و دڵە ڕاوکێیانە لە کار و کردەوەی ناپەسەندی تۆمار کراویان، بۆیە دەڵێن: هاوار لە ئێمە ئەم نامە و دۆسیەیە چیە؟! هیچ گوناهێکی وردو درشت بەجێ ناهێڵێت، بەڵکو هەمووی تۆمار کردووە، ئەو خەڵکە هەرچیان کردووە (بەدەنگ و ڕەنگەوە) ئامادەیە، بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات.

(وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا). الإسراء ( ١٣ )

واتە: نامەی کردەوەی هەر کەسێکیشمان هەڵواسیووە بە گەردنیدا و لە ڕۆژی دواییدا کارنامەی کردەوەکانی بۆ دەردەهێنین و بە کراوەیی دەخەینە بەردەستی (ئاشکرایە کە ئەو دەزگایانەی کار و کردەوەی ئێمەی لەسەر تۆمار دەکرێت زۆر پێشکەوتوو ترە لەوەی کە ئادەمیزاد تا ئێستا پەی پێ بردووە).

(اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا). الإسراء ( ١٤ )




واتە: ئەوسا پێی دەوترێت: دەی نامەی کردەوەکانت بخوێنەرەوە و تەماشای بکە، ئەمڕۆ هەر خۆت بڕیار بدە و حساب بۆ خۆت بکە (شایستەی چ جۆرە پاداشتێکیت؟!)

(فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ).الحاقة (١٩)

واتە: جا ئەوەی نامەی کردەوەکانی درایە دەستی ڕاستی، ئەوە (بە دڵخۆشیەکی بێ سنوورەوە بە هاوەڵ و ناسیاوانی) دەڵێت: ها ئەوەتا نامەی کردەوەکانم بیگرن و بخوێننەوە و تەماشای بکەن.

(إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ). الحاقة ( ٢٠ )

واتە: بەڕاستی من کاتی خۆی سوور دەمزانی و دڵنیابووم کە بەم لێپرسینەوە دەگەم!!

(فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ). الحاقة ( ٢١ )

واتە: جا ئەو بەختەوەرە لە ژیانێکی پڕ لە شادی و کامەرانیدا دەژی کە زۆر پێی ڕازیە...

(فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ). الحاقة ( ٢٢ )

واتە: لەبەهەشتی بەرزو بڵندا، (لە باخچەکانی سەر لوتکەی چیا و لاپاڵی شاخەکاندا لەناو کۆشك و تەلارەکاندا).

(قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ) الحاقة ( ٢٣ )

واتە: میوەهـاتی زۆر بە درەختـەکانیەوە شـۆڕ بۆتـەوە و لێکردنەوەی ئاسانە و لە دەست ڕەس دایە.

(كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ). الحاقة (٢٤)

واتە: ئینجا پێیان دەوترێت: بخۆن و بخۆنەوە نۆشتان بێت، بەهۆی دەست پێشکەریتان لە ڕۆژگاری ڕابردودا.

(وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ). الحاقة ( ٢٥ )

واتە: بەڵام ئەوەی نامەی کردەوەکانی دەدرێتە دەستی چەپی، ئەوە دەڵێت: خۆزگە نامەی کردەوەکانم پێ نەدرایە.

(وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ). الحاقة ( ٢٦ )

واتە: هەر نەمزانیایە لێپرسینەوەم چۆن دەبێت.

(يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ). الحاقة ( ٢٧ )

واتە: خۆزگـــە مـــردنەکەم یەکجـــاریی بوایە (ئاوا زیندوو نەکرامایەتەوە).

(مَا أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ). الحاقة ( ٢٨ )

واتە: ئەوەتە، ئەو ماڵ و سامانەی کە بووم، فریام نەکەوت (بەڵکو نەما و تەفروتونا بوو).

(هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ). الحاقة ( ٢٩ )

واتە: ئەو دەسەڵاتەی کە بووم لە دەستمدا نەما و لە دەستم چوو.

(خُذُوهُ فَغُلُّوهُ). الحاقة ( ٣٠ )

واتە: (ئەوسا ئیتر فەرمان دەدرێت) ئادەی ئێوە بیگرن و کۆت و زنجیر لە دەست و قاچ و ملی بئاڵێنن.

(ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ) الحاقة ( ٣١ )

واتە: لەوەودوا بەرەو دۆزەخ ڕاپێچی بکەن و بیبەن و بیخەنە ناوی.

## تــەرازوو (المــیزان)

لە ڕۆژی دواییدا تەرازوو دادەنرێت بۆ کێشانی چاکە و خراپەی مرۆڤەکان، ئەم تەرازووە بە هیچ جۆرێ ستەم لە کەس ناکات.

(وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَاسِبِينَ). الأنبياء (٤٧)

واتە: ئێمە پێوەر و تەرازووەکانی دادپەروەری لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، جا هیچ کەس بە هیچ شێوەیەك ستەمی لێ ناکرێت، ئەگەر بە قەدەر تۆوە خەرتەلەیەك (کە زۆر بچووك و وردە، کارێکی چاك یان خراپی ئەنجام دابێت) دەیهێنینە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە ئاوا بە وردی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین.

(وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَٰئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَظْلِمُونَ). الأعراف ( ٩ )

واتە: (بەڵام) ئەوەی تای تەرازوی (خێرو چاکەکانی سوك بێت) ئەو جۆرە کەسانە ئەوانەن کە خۆیان دۆڕان و خۆیان لەدەستدا بەهۆی ئەوەی کە بڕوایان بەبەڵگە و ئایەتەکانی ئێمە نیە و ستەم دەکەن.

(فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ). القارعة ( ٦ )

واتە: جا ئەوەی تەرازووی خێری قوورس و سەنگین بێت.

(فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ). القارعة ( ٧ )

واتە: ئەوە لە بارودۆخێکی خۆش و ئاسوودەدا ژیان دەباتە سەرو زۆر پێی ڕازیە.

(وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ). القارعة ( ٨ )

واتە: ئەوەش تەرازووی (خێرو چاکەی) سووك بێت (گوناهی زۆر بێت).

(فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ). القارعة ( ٩ )

ئەوە دایکی ئەو دۆزەخە (باوەشی بۆ کردۆتەوە)

(وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ). القارعة ( ١٠ )

جا تۆ چووزانی (هاویە) چیە؟!

(نَارٌ حَامِيَةٌ). القارعة ( ١١ )

ئاگرێکی زۆر سوتێنەر و بڵێسەدارە (هەرگیز خامۆش نابێت و تینی کەم ناکات و لە کوڵی نابێتەوە).

## پردی سیرات (الصراط)

پردێکی درێژە لەسەر پشتی دۆزەخ، سەرەتاکەی لە گۆڕەپانی مەحشەرە، کۆتاییەکەی لەبەر دەرگای بەهەشت، هەموو مرۆڤایەتی لەسەرەتاوە تا کۆتایی بەسەریدا تێپەردەبن، دوای جێهێشتنی گۆڕەپانی مەحشەر، بەهەشتیەکان بە ئاراستەی بەهەشت بەسەریدا دەپەڕنەوە، دۆزەخیەکانیش دەکەونە ناوی، یەکەم کەسیش کە بەسەریدا دەپەڕێتەوە گەورەی مرۆڤایەتی موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئوممەتەکەی بە چاکەکار و تاوانباریەوە، ئینجا چاکەکاران: خوای گەورە دەربازیان دەکات و تێیاندەپەڕێنێ، بەڵام تاوانبار و خراپەکاران دەکەونە ناوی.

(وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا). مریم ( ٧١ )

واتە: ئێوە (خەڵکینە) کەستان نیە تێپەڕ نەکات بەسەر دۆزەخدا، (ئیماندااران بۆ ئەوەی زیاتر قەدری بەهەشت و ڕەحمەتی خوا بزانن، کافران بۆ ئەوەی بکەونە ناوی) ئەم پێشهاتە بڕیاردراوە هەر جێبەجێ دەکرێت.

(ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا). مریم ( ٧٢ )

واتە: لەوەودوا ئەوانە ڕزگار دەکەین کە پارێزکار و خواناس بوون، ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا بە چۆکدا دەهێنین.

(يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ). الحديد ( ١٢ )

واتە: ڕۆژێك دێت كە دەبینیت پیاوانی ئیماندار و ژنانی ئیماندار بەرەو (بەرەو (صراط) ) (یان بەهەشت) بەڕێ دەكرێن، نوور و ڕوناكایەكی ئاشكرا لەبەردەم و لەلای ڕاستیانەوە دەڕوا، فریشتەكان پێیان دەڵێن: مژدەی ئێوە ئەمرۆ باخەكانی بەهەشتەكە چەندەها ڕوبار بەناویاندا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، ئا ئەوەیە سەركەوتن و سەرفرازی گەورە و بێسنوور.

(يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ). الحديد ( ١٣ )

واتە: (ئا لەو ڕۆژەدا كە ئیمانداران بەرەو بەهەشت بەڕێ دەكرێن) پیاوان و ژنانی دووڕوو دەهێنرێنە سەر ڕێیان، بە غەمبارییەوە بۆ ئیمانداران دەڕوانن، ئیماندارانیش هیچ لایان لێ ناكەنەوە، بۆیە بە غەمو پەژارەیەكی زۆرەوە پێیان دەڵێن: دە تەماشایەكمان بكەن با لەنووری ڕووخسارتان بەهرەوەر ببین، بەڵام پێیان دەوترێت بگەڕێنەوە دواوە، خۆتان بەشوێن نوور و ڕوناكیدا بگەڕێن، دەستبەجێ دیوارێك دروست دەكرێت لەنێوان ئیمانداران و دووڕووەكاندا دەروازەیەكیشی تێدایە، دیوی ناوەوە

کە ڕووی لەئیماندارانە ڕووی لە ڕەحمەت و بەهەشتە و دیوی دەرەوە، کە ڕووی لە دووڕووەکانە ڕووی لەسزا و دۆزەخە.

پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی پردی سیرات دەفەرموێت:

(فَيُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ جَهَنَّمَ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يَجُوزُ مِنَ الرُّسُلِ بِأُمَّتِهِ، وَلاَ يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ إِلَّا الرُّسُلُ، وَكَلاَمُ الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ: اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ. وَفِي جَهَنَّمَ كَلاَلِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، هَلْ رَأَيْتُمْ شَوْكَ السَّعْدَانِ؟ قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ: فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ قَدْرَ عِظَمِهَا إِلَّا اللَّهُ، تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ، فَمِنْهُمْ مَنْ يُوبَقُ بِعَمَلِهِ، وَمِنْهُمْ مَنْ يُخَرْدَلُ ثُمَّ يَنْجُو)[١].

(فَتَقُومَانِ جَنَبَتَيِ الصِّرَاطِ يَمِينًا وَشِمَالاً، فَيَمُرُّ أَوَّلُكُمْ كَالْبَرْقِ. قَالَ: قُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي أَيُّ شَيْءٍ كَمَرِّ الْبَرْقِ؟ قَالَ: أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ؟ ثُمَّ كَمَرِّ الرِّيحِ، ثُمَّ كَمَرِّ الطَّيْرِ، وَشَدِّ الرِّجَالِ، تَجْرِي بِهِمْ أَعْمَالُهُمْ وَنَبِيُّكُمْ قَائِمٌ عَلَى الصِّرَاطِ يَقُولُ: رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ. حَتَّى تَعْجِزَ أَعْمَالُ الْعِبَادِ، حَتَّى يَجِيءَ الرَّجُلُ فَلاَ يَسْتَطِيعُ السَّيْرَ إِلاَّ زَحْفًا، قَالَ: وَفِي حَافَتَيِ الصِّرَاطِ كَلاَلِيبُ مُعَلَّقَةٌ مَأْمُورَةٌ بِأَخْذِ مَنْ أُمِرَتْ بِهِ، فَمَخْدُوشٌ نَاجٍ، وَمَكْدُوسٌ فِي النَّارِ. وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ إِنَّ قَعْرَ جَهَنَّمَ لَسَبْعُونَ خَرِيفًا)[٢].

---

(١) رواه البخاري في «صحيحه» (رقم٨٠٦)، ومسلم في «صحيحه» (رقم١٨٢).

(٢) رواه مسلم في «صحيحه» (رقم٤٠١).

(يُؤْتَى بالجَسْر فيُجْعَلُ بينَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ، قُلْنَا: يا رَسولَ اللَّه، وما الجَسْرُ؟ قالَ: مَدْحَضَةٌ مَزِلَّةٌ، عليه خَطَاطِيفُ وكَلَالِيبُ، وحَسَكَةٌ مُفَلْطَحَةٌ لَهَا شَوْكَةٌ عُقَيْفَاءُ، تَكُونُ بنَجْد، يُقَالُ لَهَا: السَّعْدَانُ، المُؤْمنُ عَلَيْهَا كَالطَّرْف وكَالْبَرْق وكَالرِّيح، وكَأَجَاوِيد الخَيْل والرِّكَاب، فَنَاج مُسَلَّمٌ، ونَاج مَخْدُوشٌ، ومَكْدُوسٌ في نَارِ جَهَنَّمَ، حتَّى يَمُرَّ آخِرُهُمْ يُسْحَبُ سَحْبًا)[1].

واتە: (پردێك بەسەر پشتی دۆزەخ ڕادەهێڵرێت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پرد چییە؟ فەرمووی: ڕێیەكی زۆر خلیسكە، لووسە، قولاپ و دڕكی پان ڕاخراوی پێوەیە، دڕكێكی پێوەیە سەری قولاپە كە لە (نەجد) دەبێ و پێی دەگوترێ (سەعدان)، جا بڕواداران بەسەریدا تێدەپەڕن، هەندێكیان وەك ئەندازەی خێرایی چاو تێدەپەڕن، هەندێكیان وەك خێرایی تیشك، هەندێكیان وەك بایەكی بەهێز، هەندێكیان وەك ئەسپی باش و خێرا، هەندێكیان وەك سواری وڵاخی باربەر، جا هەیانە ڕزگاری دەبێ و سەلامەتە، هەشیانە ڕزگاری دەبێ، بەڵام دەڕووشێ و بریندار دەبێ، هەیانە سەرەوبن دەكەوێتە ناو دۆزەخەوە، هەتا ئەوەی كە لە كۆتاییدا هەمووواندا دێت، بە ڕاكێشران ڕای دەكێشن (واتە: وردە وردە هەرچۆنێ بێت ئەویش ڕزگاری دەبێ و بەسەریدا دەپەڕێتەوە) ).

كەواتە هەیە لەچاوتروكانێكدا بەسەریدا دەپەڕێتەوە، هەشە وەكو برووسك، هەیە وەكو با، هەشە وەكو خێرایی ئەسپ، هەیە

---

(١) صحيح البخاري ٧٤٣٩.




وەکو سواری سەر وشتر. هەیە وەکو ڕۆیشتنێکی خێرا، هەیە ئاسایی بەسەریدا تێپەڕدەبێت، هەیە وەکو خشۆکەکان بەگاگۆڵە بەسەریدا تێدەپەڕێت، هەشە بڵێسەی ئاگر ڕایدەکێشێت و فڕێدەدرێتە ناو دۆزەخ.

جا هەرکەسێك چەسپاو و سەقامگیر بێت لەسەر پرد و ڕێگای خوای گەورە لە دونیادا کە بریتییە لە ئیسلام، ئەوە سەقامیگیر و پێ چەسپاو دەبێت لەسەر ئەو پردە لە ڕۆژی دواییدا، ئەوەی پێ چەسپاو و سەقامگیر نەبێت لەسەر دینی خوای گەورە لە دونیادا ئەوا لە دوارۆژیشدا پێی جێگیر و چەسپاو نابێت لەسەر ئەو پردە.

## حـەوزی کەوسـەر (الكوثر)

حەوز: لەزمانەوانیدا واتە شوێنی کۆبوونەوەی ئاو، لێرەدا مەبەست لێی حەوزی سەردارمان موحەممەدە (صلی الله علیه وسلم) کە حەقە و هەیە، خوای گەورە لە بەهەشتدا ڕوبارێکی داوە بە پێغەمبەرمان کە ناوی کەوسەرە (الكوثر)، دوو ڕێچکە و جۆگە لەو ڕوبارە دەڕژێنە شوێنێك لە گۆڕەپانی حەشردا بەو شوێنە دەگوترێت حەوز (حوض).

حەوزی کەوسەر ئەو حەوزەیە ئیماندارانی لێ تێرئاو دەکرێت، دەربارەی ئەوەی کە ئایا ئەم حەوزە پێش پردی سیراتە یان دوای ئەو، ڕاجیایی هەیە، هەندێك دەفەرموون پێش پردی سیراتە،

هەندێکی دیکەش دەفەرموون دوای پردی سیراتە، هەر یەکێکیش بەڵگەی خۆی دێنێتەوە.

**سیفەتی حەوز:** چەندین فەرمووده لە بارەی سیفەتی حەوزەوە هاتوون، لەوانە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: درێژی حەوزەکەم یەك مانگ ڕێیە، ئاوەکەی سپیترە لە شیر، بۆنەکەی خۆشترە لە میسك، کوپەکان (کیزان) وەکو ئەستێرەکانی ئاسمانن، هەرکەس لێی بخواتەوە هەرگیز تینوی نابێتەوە[1].

## بەڵگەی بوونی کەوسەر

(حَوْضِي مَسيرَةُ شَهْر، وَزَوَايَاهُ سَوَاءٌ، وَمَاؤُه أَبْيَضُ منَ الوَرِق، وَريحُهُ أَطْيَبُ منَ المسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّماءِ، فَمَن شَرِبَ منه فلاَ يَظْمَأُ بَعْدَهُ أَبَدًا)[2].

(بيْنَا رَسولُ الله صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ ذَاتَ يَوم بيْنَ أظْهُرِنَا إذْ أغْفَى إغْفَاءَةً ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا، فَقُلْنَا: ما أضْحَكَكَ يا رَسولَ الله، قالَ: أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ فَقَرَأَ: بسْمِ الله الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ {إنَّا أعْطَيْنَاكَ الكَوْثَرَ (١) فَصَلِّ لِرَبِّكَ وانْحَرْ (٢) إنَّ شَانِئَكَ هو الأَبْتَرُ} [الكوثر: ١ - ٣]، ثُمَّ قالَ: أتَدْرُونَ ما الكَوْثَرُ؟ فَقُلْنَا اللَّهُ ورَسولُهُ أعْلَمُ، قالَ: فإنَّه نَهْرٌ وعَدَنِيهِ رَبِّي عزَّ وجلَّ، عليه خَيْرٌ كَثِيرٌ، هو حَوْضٌ تَرِدُ عليه أُمَّتي يَومَ القِيَامَةِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ، فيُخْتَلَجُ

---

(١) أخرجه البخاري (٦٥٧٩)، ومسلم (٢٢٩٢).

(٢) أخرجه البخاري (٦٥٧٩)، ومسلم (٢٢٩٢).

العَبْدُ منهمْ، فأقُولُ: رَبِّ، إنَّه مِن أُمَّتي فيَقولُ: ما تَدْري ما أحْدَثَتْ بَعْدَكَ. زَادَ ابنُ حُجْر، في حَديثه: بينْ أظْهُرنَا في المَسْجد. وقالَ: ما أحْدَثَ بَعْدَكَ. وفي روايةٍ: أغْفَى رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ إغْفَاءَةً، بنَحو حَديث ابْن مُسْهر غيرَ أنَّه قالَ: نَهْرٌ وعَدَنيه رَبي عزَّ وجلَّ في الجَنَّةِ عليه حَوْضٌ ولَمْ يَذْكُرْ آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ)[١].

## تکاکـردن (شەفاعـەت)

واتای شەفاعەت:

شەفاعەتکردن لەشتێکدا: واتە دواکردنی شتێك لە کەسێك کە خاوەنیەتی، یان لەبەردەستی ئەودایە، بەڵام بۆ کەسێکی تر نەوەك بۆخۆی، شەفاعەت لە عەرەبیدا لە وشەی (الشفع) وەرگیراوە کە بە واتای (الضم) هەماهەنگی و دەنگخستنەپاڵ دەنگی کەسێکی تر دێت، چونکە دەنگت دەخەیتە پاڵ دەنگی ئەو کەسەی کە خاوەن پێوستیە لە داواکاریەکەیدا لەپێناو بەدەستهێنانی ویست و داوایەکەی.

هەمووکەس ناتوانێت بەو کارە هەستێت، بەڵکو هەمیشە ئەوانەی شەفاعەت و تکا دەکەن کەسانێکن کە پلەیەکیان هەیە، یان بەڵێن و ڕێزێکیان هەیە لەلای کەسی داوالێکراو و بەرپرس، بۆئەوەی بتوانێت ویست و بڕیارەکە بگۆڕێت.

---

(١) أخرجه مسلم (٤٠٠).

بەڵام تکاکردن لەلای خوای گەورە لەرۆژی دواییدا ئەگەرچی تەنها ئەوکەسانە پێی هەڵدەستن کە نزیکن لە خوای گەورە، بەڵام هیچ شتێك لە قەدەری خوا ناگۆڕن، بەڵکو ئەو تکایە بریتییە لە ڕێزێك بۆ ئەوکەسانەی کە تکا دەکەن بەوەی کە چاکە لەسەر دەستی ئەوان ڕوودەدات، چونکە ئەوان تەنها تکا بۆ کەسانێك دەکەن کە خوای گەورە ڕازیە تکایان بۆ بکرێت، وە تەنها ئەوانە قسە دەکەن کە خوای گەورە ڕێگەیان پێدەدات قسە بکەن.

هەموو پێغەمبەرێك تکاو شەفاعەتی خۆی هەیە بۆ ئوممەتی خۆی، بەڵام پێغەمبەری سەردارمان (صلی الله علیەوسلم) جۆرە تکا و شەفاعەتێکی تایبەتی هەیە، جیا لە شەفاعەتی پێغەمبەرانی تر (علیهم السلام) ئەوەش وەکو ڕێز و پلە بەرزی دراوە بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ، ئەویش بریتییە لە:

شەفاعەتی گەورە: کە بریتییە لەو شەفاعەتەی کە خوای گەورە داویەتی بە پێغەمبەرمان (صلی الله علیەوسلم) بۆ دەستپێکردنی حەشکردنی خەڵك، دەربازبوون لە پاڵەپەستۆ و نارەحەتی چاوەڕوانی لە گۆرەپانی مەحشەر و ئاسودەبوونیان لە سامناکی ئەو دۆخە، لەوکاتەدا کە خەڵك تووشی بەڵاو ناخۆشی دەبن و خۆر لێیان نزیك دەکرێتەوە، تاوەکو دەمیان دەکەونە ناو ئارەقەی خۆیان، وە ئاوات بەوە دەخوازن کە دەربازیان بێت لەو دۆخە دژوارە ئەگەر بۆ ناو ئاگریش بێت، لەو کاتەدا خەڵك بەرەو پێغەمبەران دەڕۆن، داوایان لێدەکەن شەفاعەت و تکایان بۆ بکەن لەلای خوای گەورە، بۆئەوەی لەو دۆخە ڕزگاریان بکات و ئەنجام

و مەسیریان یەکلابکاتەوە، دەڕۆنە لای ئادەم (علیەالسلام)، پاشان بۆلای پێغەمبەرە (أولو العزم)ەکان، بەڵام هەموویان دەڵێن ئێمە ناتوانین ئەو کارە بکەین، بۆمان نیە، تاوەکو دێنە لای پێغەمبەر و سەردارمان موحەممەد (صلی الله علیەوسلم)، لە وەڵامدا پێیان دەڵێت: ئەوە کاری منە، دەچێتە سوجدەوە و کڕنوش دەبات لەژێر عەرشی پەروەردگار، پێیدەگوترێت: ئەی موحەممەد سەرت بەرزبکەوە، قسە بکە ئەوە گوێت لێدەگیرێت و قسەکەت بیستراوە، وە داوا بکە داواکاریەکەت پێدەدرێت، شەفاعەت و تکا بکە تکا و شەفاعەتەکەت وەردەگیرێت، ئا ئەوە تکا و شەفاعەتی گەورەیە، وە مەقامی مەحمود کە گرۆی ئادەمیزاد لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئاواتیان ئەوەبوو کە ئەو پلەیان هەبووایە[١].

---

(١) فروى أبو هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قال: (( أُتِيَ رَسُولُ الله صَلىَّ اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ يَوْمًا بلَحْم، فَرُفِعَ إِلَيْه الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ فَنَهَسَ منْهَا نَهْسَةً فَقَالَ: أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَة، وَهَلْ تَدْرُونَ بمَ ذَاكَ؟ يَجْمَعُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَة الْأَوَّلينَ وَالْآخرينَ في صَعِيد وَاحد، فَيُسْمعُهُمُ الدَّاعي، وَيَنْفُذُهُمُ الْبَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ فَيَبْلُغُ النَّاسَ منَ الْغَمِّ وَالْكَرْب مَا لَا يُطيقُونَ، وَمَا لَا يَحْتَملُونَ (وفي رواية ابن حبَّان: ((وَتَدْنُو الشَّمْسُ منْ رُؤوسهمْ فَيَشْتَدُّ عَلَيْهِمْ حَرُّهَا وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ دُنُوُّهَا منْهُمْ فَيَنْطَلقُونَ منَ الْجَزَع وَالضَّجَر ممَّا هُمْ فيه فَيَأْتُونَ آدَمَ)) وفي حديث أبي أمامة عند أحمد: ((تَدْنُو الشَّمْسُ يَوْمَ الْقيَامَة عَلَى قَدْر ميل، وَيُزَادُ في حَرِّهَا كَذَا وَكَذَا يَغْلي منْهَا الْهَامُّ كَمَا تَغْلي الْقُدُورُ، يَعْرَقُونَ فيهَا عَلَى قَدْر خَطَايَاهُمْ منْهُمْ مَنْ يَبْلُغُ إِلَى كَعْبَيْه، وَمنْهُمْ مَنْ يَبْلُغُ إِلَى سَاقَيْه، وَمِنْهُمْ مَنْ يَبْلُغُ إِلَى وَسَطِه، وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ الْعَرَقُ))

) فيقول بَعْضُ الناس لبَعْض ألا تَرَوْنَ ما أَنْتُمْ فيه؟ ألا تَرَوْنَ ما قد بَلَغَكُمْ؟ ألا تَنْظُرُونَ من يَشْفَعُ لَكُمْ إلي رَبِّكُمْ فيقول بَعْضُ الناس لبَعْض: ائْتُوا آدَمَ (وفي حديث أنس: ((لَو اسْتَشْفَعْنَا عَلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا))، ويكون ذلك حين تزلف الجنة كما في حديث حذيفة عند مسلم: ((فَيَقُومُ الْمُؤْمِنُونَ حَتَّى تُزْلَفَ لَهُمُ الْجَنَّةُ، فَيَأْتُونَ آدَمَ، فَيَقُولُونَ: يَا أَبَانَا، اسْتَفْتِحْ لَنَا الْجَنَّةَ، فَيَقُولُ: وَهَلْ أَخْرَجَكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ إِلَّا خَطِيئَةُ أَبِيكُمْ آدَمَ، لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ))، وفي حديث أنس عند أحمد: ((يُطَوِّلُ يَوْمُ الْقِيَامَةِ عَلَى النَّاسِ، فَيَقُولُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْطَلِقُوا بِنَا إِلَى آدَمَ أَبِي الْبَشَرِ، فَيَشْفَعُ لَنَا إِلَى رَبِّنَا، فَلْيَقْضِ بَيْنَنَا)) ) فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ: يا آدَمُ أنت أبو الْبَشَرِ خَلَقَكَ الله بيده وَنَفَخَ فيكَ من رُوحه وَأَمَرَ الْمَلَائِكَةَ فَسَجَدُوا لك اشْفَعْ لنا إلى رَبِّكَ ألا ترى إلى ما نَحْنُ فيه؟ ألا تَرَى إلى ما قد بَلَغَنَا؟ (وفي حديث أنس عند الشيخين: ((فَاشْفَعْ لَنَا عِنْدَ رَبِّكَ حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا، فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ)) فأخبرهم أن هذا المقام العظيم ليس له بل لغيره، ولذا قال: ((لَسْتُ لَهَا))، وَفِي رِوَايَةِ حُذَيْفَةَ عند مسلم: ((لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ)) ويبين عليه السلام عذره في ذلك) فَيَقُولُ آدَمُ: إِنَّ رَبِّي غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ، فَيَأْتُونَ نُوحًا، فَيَقُولُونَ: يَا نُوحُ، أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى الْأَرْضِ، وَسَمَّاكَ اللَّهُ عَبْدًا شَكُورًا، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُ بِهَا عَلَى قَوْمِي، نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُونَ: أَنْتَ نَبِيُّ الله وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الْأَرْضِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ؟ أَلَا تَرَى إِلَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ إِبْرَاهِيمُ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَا يَغْضَبُ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَذَكَرَ كَذَبَاتِهِ، نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى

غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى، فَيَأْتُونَ مُوسَى صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ، فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى، أَنْتَ رَسُولُ الله فَضَّلَكَ اللهُ برسَالَاته، وَبتَكْليمه عَلَى النَّاس، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ مُوسَى صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مثْلَهُ، وَإِنِّي قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ أُومَرْ بقَتْلهَا، نَفْسي نَفْسي، اذْهَبُوا إِلَى عيسَى صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ، فَيَأْتُونَ عيسَى، فَيَقُولُونَ: يَا عيسَى أَنْتَ رَسُولُ الله، وَكَلَّمْتَ النَّاسَ في الْمَهْد، وَكَلمَةٌ منْهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ، وَرُوحٌ منْهُ، فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ فَيَقُولُ لَهُمْ عيسَى صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ: إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مثْلَهُ، وَلَمْ يَذْكُرْ لَهُ ذَنْبًا، نَفْسي نَفْسي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي، اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّد، فَيَأْتُوني فَيَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ، أَنْتَ رَسُولُ الله، وَخَاتَمُ الْأَنْبيَاء، وَغَفَرَ اللهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ منْ ذَنْبكَ، وَمَا تَأَخَّرَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلَا تَرَى مَا نَحْنُ فيه؟ أَلَا تَرَى مَا قَدْ بَلَغَنَا؟ (وفي حديث أنس عند أحمد: ((إِنِّي لَقَائمٌ أَنْتَظرُ أُمَّتي تَعْبُرُ الصِّرَاط، إِذْ جَاءَني عيسَى فَقَالَ: هَذه الْأَنْبيَاءُ قَدْ جَاءَتْكَ يَا مُحَمَّدُ يَسْأَلُونَ -أَوْ قَالَ: يَجْتَمعُونَ إِلَيْكَ- وَيَدْعُونَ اللهَ، أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ جَمْع الْأُمَم إِلَى حَيْثُ يَشَاءُ اللهُ، لغَمِّ مَا هُمْ فيه؛ فَالْخَلْقُ مُلْجَمُونَ في الْعَرَق. فَأَمَّا الْمُؤْمنُ، فَهُوَ عَلَيْه كَالزَّكْمَة، وَأَمَّا الْكَافرُ فَيَتَغَشَّاهُ الْمَوْتُ)) ) فَأَنْطَلقُ، فَآتي تَحْتَ الْعَرْش، فَأَقَعُ سَاجدًا لرَبِّي، ثُمَّ يَفْتَحُ اللهُ عَلَيَّ وَيُلْهمُني منْ مَحَامده، وَحُسْن الثَّنَاء عَلَيْه شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ لأَحَد قَبْلي، ثُمَّ يُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، اشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسي، فَأَقُولُ: يَا رَبِّ، أُمَّتي أُمَّتي، فَيُقَالُ: يَا مُحَمَّدُ، أَدْخلْ الْجَنَّةَ منْ أُمَّتكَ مَنْ لَا حسَابَ عَلَيْه منَ الْبَاب الْأَيْمَن منْ أَبْوَاب الْجَنَّة، وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاس فيمَا سوَى ذَلكَ منَ الْأَبْوَاب، (وفي حديث أنس عند الترمذي: ((فَآخُذُ بحَلْقَة بَاب الْجَنَّة فَأُقَعْقعُهَا، فَيُقَالُ: من هذا؟ فَيُقَالُ: مُحَمَّدٌ، فَيَفْتَحُونَ لي وَيُرَحِّبُونَ فَيَقُولُونَ: مَرْحَبًا فَأَخِرُّ سَاجدًا فَيُلْهمُني الله

**شەفاعەت دوو مەرجی هەیە:**

**١.** مۆڵەت و ئیزنی خوای گەورە، (مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ). البقرة ٢٥٥. واتە: کێیە ئەوەی (دەتوانێت) تکا بکات لە لای ئەو (خودا)، بەبێ مۆڵەتی خۆی.

**٢.** ڕازیبوونی خوای گەورە لە شەفاعەت بۆ کراو، (يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ). الأنبياء ( ٢٨ )

---

من الثَّنَاء وَالْحَمْد فَيُقَالُ لي: ارفَعْ رَأْسَكَ سل تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ وَقُلْ يُسْمَعْ لقَوْلكَ، وهوَ الْمَقَامُ الْمَحْمُودُ الذي قال الله ﴿ عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا ﴾ [الإسراء:٧٩]))
وفي رواية مسلم عن أنس: ((آتي بَابَ الْجَنَّة يَوْمَ الْقيَامَة فَأَسْتفْتح، فَيَقُولُ الْخَازنُ: مَنْ أَنْتَ؟ فَأَقُولُ: مُحَمَّدٌ، فَيَقُولُ: بكَ أُمرْتُ لَا أَفْتَحُ لأَحَد قَبْلَكَ))، وفي حديث أنس عند البخاري: ((فَأَسْتَأْذنُ عَلَى رَبِّي، فَإذَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجدًا، فَيَدَعُني مَا شَاءَ اللهُ، ثُمَّ يُقَالُ لي: ارفَعْ رَأْسَكَ: سَلْ تُعْطَهْ، وَقُلْ يُسْمَعْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسي، فَأَحْمَدُ رَبِّي بتَحْميد يُعَلِّمُني، ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لي حَدًّا، ثُمَّ أُخْرجُهُمْ منَ النَّار، وَأُدْخلُهُمُ الجَنَّةَ، ثُمَّ أَعُودُ فَأَقَعُ سَاجدًا مثْلَهُ في الثَّالثَة، أَو الرَّابعَة، حَتَّى مَا بَقيَ في النَّار إلَّا مَنْ حَبَسَهُ القُرْآنُ)) وَكَانَ قَتَادَةُ، يَقُولُ عَنْدَ هَذَا: ((أَيْ: وَجَبَ عَلَيْه الخُلُودُ)) وفي آخر الحديث قال النبي صَلَّى اللهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ: وَالَّذي نَفْسُ مُحَمَّد بيَده، إنَّ مَا بَيْنَ الْمصْرَاعَيْن منْ مَصَاريع الْجَنَّة لَكَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَهَجَرٍ، أَوْ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى)) رَوَاه البخاريَ وَمسلم.

واتە: هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵكە لە ڕابوردوودا چیان ئەنجامداوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن (دونیا و قیامەت، ڕابوردوو و داهاتوو، بۆ ئەو زاتە چوونیەكە)، فریشتەكانیش تكاكار نابن تەنها بۆ ئەو كەسانە نەبێت خوا پێی ڕازییە و ئەو فریشتانە لە ترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچیەك ئەنجام بدەن.

## بەرەو بەهەشت

بەدەستهێنانی بەهەشت _ وەك هەموو شتەكانی دیكە _ مەرج و ڕێكاری خۆی هەیە، بۆنموونە: كار و كردەوەی باش و چاك:

واتە:(وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ).الزخرف (٧٢)

(خوای میهرەبان ئەوەندەی تر دڵخۆشیان دەكات، كاتێك پێیان دەفەرموێت): ئا ئەو بەهەشتەی كە ئێستا ئێوە بوونەتە خاوەنی، وەك میراتیی شایستەی خۆتانە، بەهۆی ئەو كار و كردەوانەی كە دەتانكرد.

(وَنُودُوا أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ).الأعراف (٤٣)

واتە: ئەوسا بانگیان لێكرا: ئەوە ئەو بەهەشتەیە كە پێتان دراوە بەهۆی ئەو كار و كردەوانە كە ئەنجامتان داوە.

### هەندێ لە کارە باش و چاکەکان

**١.** تەزکیەی نەفس: (جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ مَن تَزَكَّىٰ). طه ( ٧٦ )

واتە: بەهەشتی - عەدەنە - کە باخەکەنی چڕوپڕە دەچنە ناوی، چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاورێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا، ئەوەش پاداشتی کەسێکە دڵ و دەروون و ڕەوشتی خۆی خاوێن کردبێت.

**٢.** دوورکەوتنەوە لە گوناهی گەورە: (إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا). النساء ( ٣١ )

واتە: ئەگەر خۆتان بپارێزن لەو تاوانە گەورانەی قەدەغە کراوە لێتان، ئەوە لە گوناهەکانی ترتان چاوپۆشی دەکەین و دەتانخەینە جێیەکی خۆش و سازگار و ڕێزدارەوە (کە بەهەشتی بەرینە).

**٣.** تەوبە و گەڕانەوە بۆلای خوای گەورە: (فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا). مريم ( ٥٩ )

لە دوای ئەوان کەسانێك لە نەوەکانیان بوونە جێنشین، کە نوێژەکانیان بەزایە داو شوێنی ئارەزووەکانی نەفسیان کەوتن، ئەوانە تووشی گومڕای و سەرگەردانی و سزا دەبن (لە دنیا و قیامەتدا).

(إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْئًا). مريم ( ٦٠ )

واتە: جگە لەوانەی کە تەوبە دەکەن و باوەڕی دامەزراو دەهێنن و کارو کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت.

٤. ئارامگری لەسەر ناخۆشی و نەخۆشی: (أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّىٰ يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَىٰ نَصْرُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ). البقرة ( ٢١٤ )

واتە: ئایا لاتان وایە هەروا بە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە (بێ تەنگانە و ناخۆشی)؟! مەگەر نموونەی ئیماندارانی پێشووتان بۆ باس نەکراوە، کە تووشی شەڕ و ناخۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون و تەکانیان خواردووە و زۆریان بۆ هاتووە بەرادایەك، هەتا پیغەمبەرەکەیان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵیدا، دەیانوت: کەی پەروەردگار سەرکەوتن دەبەخشێت؟! ئیتر کەی خوا یارمەتی دەنێرێت؟! ئاگاداربن و دڵنیابن بەڕاستی یارمەتی خوایی زۆر نزیکە.

٥. تەقوا و خۆپارێزی: (تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا). مريم ( ٦٣ )

واتە: ئەو بەهەشت و شوێنە خۆشە، بەو بەندانەمان دەبەخشین و دەیانکەینە خاوەنی، کە خواناس و پارێزکارن.

٦. جیهاد (بە هەموو جۆرەکانیەوە) لە پێناو خوای گەورەدا: (أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ). آل عمران ( ١٤٢ )

واتە: یان وا گومانتان دەبرد (هەروا بەئاسانی) دەچنە بەهەشتەوە؟! کە هێشتا خوا (لە جیهانی واقیعدا) دەریشی نەخستووە کامتان هەوڵ و کۆشش و جیهادی کردووە و کامتان خۆڕاگر و ئارامگر بووە ...

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ). الصف ( ١٠ )

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، دەستنیشانی بازرگانیەکتان بۆ بکەم، کە لە سزایەکی بە ئێش ڕزگارتان بکات؟!

(تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ). الصف ( ١١ )

واتە: سەرەتا باوەڕهێنانتانە بە خواو پێغەمبەرەکەی، ئینجا هەوڵ و تێکۆشانتانە لە ڕێگەی خوادا بە بەخشینی ماڵ و سامانتان، وە بەخشینی خۆتان (واتە: ماندووکردنی جەستە و بیروهۆشتان، تا بەخت کردنیان لەپێناوی خوادا) بێگومان ئەو کارەتان چاکتر و بەفڕترە بۆتان ئەگەر بزانن و تێبگەن.

(يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ). الصف ( ١٢ )

واتە: ئەوسا خوا لە گوناهو هەڵەكانتان خۆش دەبێت و دەتانخاتە باخەكانی بەهەشتەوە لە چەندەها ڕوبار بەژێر درەختەكانیدا تێ دەپەڕێت و جاریە، هەروەها كۆشك و تەلاری خۆش و ڕازاوە و پاك و خاوێن لە باخەكانی بەهەشتی عەدندا، بەڕاستی ئا ئەوەیە سەركەوتن و سەرفرازی و دەستكەوتی گەورە و بێسنوور.

٧. شەهیدبوون لەپێناو خوای گەورەدا: (وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ). محمد ( ٤ )

واتە: ئەوانەش لە پێناوی خوادا شەهید بوون، هەرگیز پاداشتی هەوڵ و كۆششیان بەزایە نادات.

(سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ). محمد ( ٥ )

واتە: ئەوانە ڕێنموویی دەكات بۆ جێگە و ڕێگەی خۆش و دڵ و دەروون و بیر و هۆشیان ئاسوودە دەكات.

٨. نوێژ و بەخشین لەپێناو خوای گەورەدا: (وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ). الرعد ( ٢٢ )

واتە: ئەوانەشن كە دانیان بەخۆدا گرت و بە ئارام بوون بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگاریان و نوێژەكەشیان بە

چاکی ئەنجامداوە و لەو ڕزق و ڕۆزیەش کە پێیان بەخشیوون بەخشیویانە، بەنهێنی و بە ئاشکراو بە چاکەکاری و شێوازی جوان پاڵ بە نادروستی و هەڵە و خراپکارایەوە دەنێن، ئا ئەوانە سەرئەنجامەکەیان ئەو خانووبەرە (ڕازاوەیەیە لە بەهەشتدا)....

(جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَالْمَلاَئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ) الرعد ( ٢٣ )

واتە: کە باخەکانی بەهەشتی_عەدنە_ بۆیان ڕازاوەتەوە، بە شادیەوە دەچنە ناوی، هاوڕێ لەگەڵ هەر کەسێك چاك و پاك و خواناسە لە باووباپیران و هاوسەرانیان و نەوەکانیان، جا فریشتەکان دەچن بۆ سەردانیان لە هەموو دەروازەکانەوە ...

(سَلاَمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ) الرعد ( ٢٤ )

واتە: دەڵێن: سڵاوتان لێ بێت بە هۆی خۆگرتنتانەوە (لە بەرامبەر کێشەکانی ژیان، لەبەرامبەر گاڵتەجاڕیی خوانەناسان ...) کەوابوو ئای چەندە جێگە و ڕێگەیەکی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەر کرد.

٩. شەونوێژ: (إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ). الذاريات ( ١٥ )

واتە: بەڕاستی پارێزکارانیش لەباخەکان و کانیاوەکانی بەهەشتدا ژیانی خۆش دەبەنەسەر.

(آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ) الذاريات ( ١٦ )

ئەو شتانەی کە پەروەردگار بۆی ئامادە کردون پێیان دەبەخشێت، ئەوانەیش بەخۆشی و شادیەوە وەریدەگرن، بەڕاستی ئەوانە پێشتر لە دونیاداچاکەکار و چاکەخواز بوون ...

(كَانُوا قَلِيلاً مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ). الذاريات ( ١٧ )

لەشەوگاردا زۆر کەم دەخەوتن و ڕادەکشان (چونکە سەرگەرمی شەو نوێژ و دەور کردنەوەی قورئان و یادی خوا بوون) ...

(وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ). الذاريات ( ١٨ )

لەبەرەبەیانەکانیشدا داوای لێخۆشبوونیان لەپەروەردگاریان دەکرد (تا لێیان ببورێت) ...

(وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ). الذاريات ( ١٩ )

لەماڵ و سامانیشیاندا بەشی هەژار و نەداریان تەرخان کردبوو.

**١٠.** تەوەکول و پشتبەستن بە خوای گەورە: (وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ الْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ). العنكبوت ( ٥٨ )

واتە: جا ئەوانەی کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە و کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، سوێند بە خوا ئەوانە لە بەهەشتدا لە چەندەها کۆشك و تەلار و ژووری بەرزدا دادەبەزێنین، کە چەندەها ڕووبار و تاڤگە بەژێر درەختەکانیدا و بە بەردەم کۆشك و تەلارەکانیدا دەڕوات، (ئەو بەختەوەرانە) ژیانی نەبڕاوە

لەو (شوێنە خۆشانەدا) دەبەنە سەر، ئای چەند جوانە پاداشتی ئیشکەران بۆ خوا ...

(الَّذِينَ صَبَرُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ). العنكبوت ( ٥٩ )

ئەوانەن خۆگربوون لەبەردەم ئەشکەنجە و ئازاری بێ باوەڕاندا و هەر پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن ...

**١١.** ترسان لە پایە و شکۆی خوای گەورە: (وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَىٰ). النازعات ( ٤٠ )

واتە: بەڵام ئەوەی لە پایە و شکۆی پەروەردگاری ترسابێت و حیسابی بۆ کردبێت و جڵەوی نەفسی گرتبێتەوە لە هەموو هەواو هەوەس و ئارەزوویەکی نادروست ...

(فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَىٰ). النازعات ( ٤١ )

بێگومان هەر بەهەشت جێگەی مانەوە و حەوانەوە و گوزەرانیەتی.

هەندێ لە کارە چاکەکان لە قورئاندا

(قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ). المؤمنون ( ١ )

واتە: بە ڕاستی ئەو بڕوادارانە سەرکەوتوو سەرفراز بوون ...

(الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ). المؤمنون ( ٢ )

ئەوانەش ئەوانەن کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراون و دڵیان لای خوایە ...

(وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ). المؤمنون ( ٣ )

ئەوانەش کە لە گوفتاری بێ سوود و کرداری نابەجێ و بێ هوودە دوورە پەرێزن ...

(وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ). المؤمنون ( ٤ )

هەروەها ئەوانەش کە زەکاتی ماڵیان دەردەکەن ...

(وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ). المؤمنون ( ٥ )

ئەوانەش کە پارێزەری داوێنی خۆیانن ...

(إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ). المؤمنون ( ٦ )

جگە لەگەڵ هاوسەران و کەنیزەکەکانیاندا نەبێت، کە ئەوە جێگەی لۆمە و سەرزەنشت نیە، (لە بارودۆخی نائاسایدا بەهۆی جەنگەوە ئافرەتانی موسڵمان دەکەونە دەست دوژمنان و دەستدرێژی بێ سنوور دەکرێتە سەریان، دوور نیە ئافرەتانی دوژمن نەکەوێتە دەست ئیمانداران، ئەو کاتە تەنها یەك کەس دەبێتە هاوسەریو، بە ڕێزەوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکات).

(فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ). المؤمنون ( ٧ )

جا ئەوەی جگە لەو سنوورە دیاری کراوە، ڕێگە و ڕێبازی تر بگرێتەبەر، ئەو جۆرە کەسانە بە یاخی و لە سنوور دەرچوو دەژمێردرێن.

(وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ). المؤمنون ( ٨ )

هەروەها ئەوانەی کە چاودێری ئەمانەت و پەیمانەکانیان دەکەن (خیانەت و فێڵ ناکەن).

(وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ). المؤمنون ( ٩ )

ئەوانەش کە پابەندی نوێژەکانن و لە کاتی خۆیدا بە ڕێکوپێکی ئەنجامی دەدەن و دەیپارێزن.

(أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ). المؤمنون ( ١٠ )

ئا ئەوانە میراتگران و خاوەنانی بەهەشتن.

(الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ). المؤمنون ( ١١ )

ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردەوس (کە بەرزترین و بە نرخترین بەهەشتە) و بۆ هەمیشە ژیانی نەبڕاوەی تیادا دەبەنە سەر (لەو پەڕی لاوێتی و تەندروستی ئاسوودەییدا).

(وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا). الفرقان ( ٦٣ )

واتە: بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن کە زۆر بە هێمنی و سەلاری و سەنگینی بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسە و قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو (ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن).

(وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا). الفرقان ( ٦٤ )

ئەوانەی کە شەوگار بۆ پەروەردگاریان بە سوژدە و وەستاون و نوێژ دەبەنە سەر.

(وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا). الفرقان ( ٦٥ )

ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا، لەسزای ئاگری دۆزەخ بەدوورمان بکە و پەنامان بدە، چونکە سزاو ئازاری لە کۆڵ نابێتەوە و بەردەوامە (بۆ ئەوکەسەی خوانەناس و یاخیە).

(إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا). الفرقان ( ٦٦ )

بەڕاستی ئەو دۆزەخە شوێن و نیشتەجێیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە (ئاهو ناڵەو پەشیمانی بێ سنوورە تیایدا).

(وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا). الفرقان ( ٦٧ )

(هەروەها بەندەکانی خوای میهرەبان) ئەوانەن کە: کاتێك ماڵ و سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەکەن، نە زیادەڕەوی تێدا دەکەن و بە زایەی دەدەن، نە دەست نوقاو و ڕەزیلیشن، بەڵکو لەو نێوانەدان (مام ناوەندین و لە شتی بەسوود بەکاری دەهێنن).

(وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا). الفرقان ( ٦٨ )

هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بە حەق

و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە تووشی سزا و ئازار و ڕیسوایی دەبێت.

(يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا). الفرقان (٦٩)

لە قیامەتیشدا ئازار و سزای بۆ چەند بەرابەر دەکرێت و بە زەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتە سەر.

(إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا). الفرقان ( ٧٠ )

مەگەر ئەو کەسەی تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت و کار وکردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا کار و کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، چونکە هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (بەرامبەر خەڵکی بە گشتی و ئەو جۆرە کەسانە بەتایبەتی).

(وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَإِنَّهُ يَتُوبُ إِلَى اللَّهِ مَتَابًا). الفرقان (٧١)

جا ئەوەی کە تەوبە دەکات و کار و کردەوەی چاکە ئەنجام دەدات و بەتەمایە پەروەردگار تەوبەکەی لێوەربگرێت؛ ئەوە بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا بە تەوبەیەکی ڕاست و دروستەوە.

(وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا). الفرقان ( ٧٢ )

(بەندەکانی خوای میهرەبان) ئەوانەشن کە شایەتی ناحەق نادەن، هەرگیز لە شوێنێکدا ئامادە نابن کە شایەتی ناحەقی تێدا ئەنجام دەدرێت و یان درۆی تێدا دەکرێت، کاتێکیش بە لای گەمە و گاڵە و چەپۆکانی نەفاماندا تێدەپەڕن، بە هێمنی و لەسەرخۆیی و سەربەرزیەوە تێدەپەڕن.

(وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا). الفرقان ( ٧٣ )

هەروەهاائەوانەش؛کاتێكبەئایەتوفەرمانەکانیپەروەردگاریان بێدار بکرێنەوە، هەروا بەکەڕی و کوێری بەلایاندا تێناپەڕن (بەڵکو تێدەفکرن و لێکی دەدەنەوە و پاشان پەیڕەوی دەکەن).

(وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا). الفرقان ( ٧٤ )

ئەوانەشن کە دەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمان کە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان.

(أُولَٰئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا). الفرقان ( ٧٥ )

ئەو جۆرە کەسانەی (کە باسکران) پاداشتیان ژوورە (ڕازاوە و بەرزو خۆشەکانی بەهەشتە) لە بەرامبەر خۆگرتن و

ئارامگرتنیانەوە، جا لەوێ بە سڵاو و درووود پێشوازیان لێدەکرێت (بۆ هەمیشە دەحەوێنەوە تیایدا).

(خَالِدِينَ فِيهَا حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا). الفرقان ( ٧٦ )

بێگومان لە ناو ژوورەکانی بەهەشتدا ژیانی کامەرانی و بەردەوام دەبەنە سەر، بەڕاستی جێگە و ڕێگە و نیشتەجێییەکی خۆش و سازگار و ڕازاوەیە.

(إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَىٰ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُم بِهِ وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ). التوبة ( ١١١ )

واتە: بەڕاستی خوا، گیان و ماڵی لە ئیماندااران کڕیوە بەوەی کە بەهەشت بۆ ئەوان ەو بەشیانە (بەڕاستی پەروەردگارێکی بەخشندەیە، هەر خۆی بەخشێنەری گیان و ماڵ و سامانە، کەچی ئاوا مامەڵە دەکات لەگەڵ ئیماندااراندا و نرخێکی نەبڕاوە، نرخێکی زۆر گەورەی بۆ بڕیارداوە، کاتێك لە پێناوی ئەودا دەیبەخشن) ئەوانە دەجەنگن لە پێناوی ئاینی خوادا، دوژمنانی ئاینی خوا دەکوژن (لە گۆڕەپانی جەنگدا)، یان دەکوژرێن و (شەهید دەکرێن)، ئەو پاداشت و بەڵێنە بەڕاستی لەسەر خوایە و باس کراوە لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا، جا کێ هەیە بە قەدەر خوا بەوەفا و بەئەمەك بێت بۆ جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی، کەواتە

زۆر دڵخۆش و کامەران بن بەو مامەڵەیەی کە ئەنجامتانداوە و بەو فرۆشتن و کڕینەی کە لەسەری ڕێککەوتوون، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی و سەرکەوتنی نەبڕاوە و بێ سنوور.

(التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدُونَ الْآمِرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكَرِ وَالْحَافِظُونَ لِحُدُودِ اللَّهِ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ). التوبة ( ١١٢ )

(جا ئەوانەی ئەو مامەڵەیە دەکەن پێشتر بەم سیفەتە پیرۆزانە خۆیان ڕازاندۆتەوە): تەوبەکارن و لە هەڵەکانیان پەشیمانن، خواپەرستن (لە هەموو هەڵسوکەوتیاندا)، سوپاسگوزارن (لەسەر هەموو نازونیعمەتێك)، گەڕۆکن (لەسەر زەویدا، ئەندێشەو بیر و هۆش بەکاردەهێنن بۆ بیر کردنەوە لە بونەوەر و دەوروبەر)، سوژدەبەر و کڕنوشبەر و نوێژ خوێنن، فەرماندەرن بەهەموو چاکەیەك، قەدەغەی خراپە و هەموو نادروستیەك دەکەن و پارێزەرن بۆ سنوورەکانی خواو قەدەغەکراوەکانی، ئینجا مژدە بدە بە ئیمانداران (ئەوانەی ئەو سیفاتانە لە خۆیاندا دەهێننە دی).

(وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ). آل عمران ( ١٣٣ )

واتە: بەپەلە بن و پێشبڕکێ بکەن تا دەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێك کە پانایيەکەی ئاسمان و زەوی گرتۆتەوە و ئامادەکراوە بۆ پارێزکاران، (پێغەمبەریش (صلی الله

علیه وسلم) دەفەرمویێت: مەنزڵگای هەندێ دەبینن وەکو چۆن ئەستێرەی گەش دەبینن لە دوورەوە، فەرموویانە ئەی پێغەمبەری خوا: ڕەنگە ئەوانە مەنزڵگای پێغەمبەران بن، فەرمویەتی: نەخێر، بەڵکو مەنزڵگای کەسانێکن کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوە، جا لەم سەردەمانەی دوایدا زانراوە ئەستێرەی چەندە گەورە گەورە هەیە کە خۆر لەئاستیاندا زۆر بچوکە چ جای زەوی!!)

(الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ). آل عمران ( ١٣٤ )

ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوە و خۆگرن، لە خەڵکی خۆش دەبن و لێبووردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکار و چاکەخوازانی خۆش دەوێت.

(وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ). آل عمران ( ١٣٥ )

ئەوانەش کە تاوان یان گوناهێك ئەنجام دەدەن، یاخود ستەم لە خۆیان دەکەن (دوایی بە خۆیاندا دێنەوە و سزای) خوا دێتەوە یادیان، ئەوسا داوای لێخۆشبوون دەکەن، جا کێ هەیە کە لە گوناهان خۆش ببێت جگە لە خوا؟! هەروەها لەسەر گوناهو تاوانیان بەردەوام نابن، لە کاتێکدا دەزانن (ئەوە تاوانە).

(أُوْلَئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ). آل عمران ( ١٣٦ )

ئا ئەوانە پاداشتیان لێخۆشبوون و لێبووردنە لە لایەن پەروەردگاریانەوە لەگەڵ باخەکانی بەهەشتدا کە چەندان ڕووبار بەژێر درەخت و بە بەردەم کۆشکەکانیاندا دەڕوات و ژیانی هەمیشەیی تیایدا دەبەنەسەر، ئەم بەهرەیە پاداشتێکی زۆر چاکی کۆششکارانە (چونکە دوای تەوبەکەیان لە هەوڵ و کۆششی بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا دەبن).

## بەڵگەکانی زیندوبوونەوە لە قورئاندا

قورئان چەند بەڵگەیەكی هێناوە لەبارەی دروستی زیندووكرنەوە و وەرگرتنی جەزای دادپەروەرانە بەپێی كردەوەكان، لەوانە:

**١- دروستكردنی بوونەوەر لە نەبوونەوە: خودای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِ﴾.[1] واتا: ((خودای گەورە ئەو زاتەیەكە بوونەوەر لە نەبوونەوە دروست دەكات، پاشان دووبارە دوای مردنیان زیندوویان دەكاتەوە كە دیارە ئەوە بەلایەوە ئاسانتریشە.))

ئەوە پێوانەیەكی سەرەتایی عەقڵیە كە قورئان دەیهێنێتەوە بۆ دروستی زیندووبوونەوەی جەستەكان و وەڵامدانەوەی ئەوانەی ئینكاری لەو بابەتە دەكەن و دەڵێن شتێكی مەحاڵە.

باشە دروستكردن لە نەبووەوە قورسترە یان دروستكرنەوەی دوای دروستكردن؟!

باشە كەسێك بتوانێت لە نەبووەوە بێنێتە بوون، چۆن ناتوانێ جارێكی تر بیهێنێتەوە بوون؟

ئەگەر وابێت، نابێت بێباوەڕەكان باوەڕیان بە خۆشیان هەبێت، چونكە نەك ئەوان بەڵكوو هەموو بوون و گەردوون لە نەبووەوە

---

(١) الروم: ٢٧.

پەیدابووە، وەك زانستی فیزیا نەبوویی و سەرەتایی بوون و گەردونی سەلماندووە.

**٢- دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی:** پاشان سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ بەڵگەیەکی دی، کە ئەویش دروستکردنی ئەو گەردوونە مەزن و فراوانەیە: ﴿لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾﴾.[١] واتا: ((دروستکرنی ئاسمان و زەوی گەورەتر و مەزنترە لە دروستکردنی مرۆڤەکان، بەڵام زۆربەی مرۆڤەکان ئەوە نازانن.))

**٣- زیندووکردنەوە و سەوزکردنەوەی زەوی (لەدوای وشك بوون و زەردبوونی):** یەکێکی تر لەو بەڵگانەی کە قورئان ئاماژەی پێ دەدات لە بارەی زیندووبوونەوە، بریتییە لە زیندووکردنەوەی ئەو زەویە کە وشك و زەرد دەبێت، کاتێك باران بەسەریدا دەبارێت دووبارە زیندوو دەبێتەوە و سەوزایی و گژ و گیا دووبارە زەوی دادەپۆشێت، جا مرۆڤیش زۆر بەو زەویە دەچێت کە لێی دروستکراوە و تێیدا دەژییێت.﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾[٢]

---

(١) غافر: ٥٧.

(٢) فصلت: ٣٩.

**٤- یەکسان نەبوونی چاکەکاران و خراپەکاران:** یەکێکی تر لەو بەڵگانەی کە قورئان دەیهێنێتە بەردەمان لەسەر زیندوبوونەوە و وەرگرتنەوەی جەزای کردەوەکان بریتییە لەوەی کە نابێت چاکەکاران و خراپەکاران یەکسان ببن و وەکوو یەك بن، کە ئەوەش هەم عەقڵ و هەم فیترەت ڕەتی دەکەنەوە و بە مەحاڵی دادەنێن کە کەسی باش و کەسی لاڕێ وەکو یەك بن و یەك ئەنجامیان هەبێت: ﴿أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلۡمُفۡسِدِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلۡمُتَّقِينَ كَٱلۡفُجَّارِ ٢٨﴾[1]

---

(١) ص: ٢٨.

## فەلسەفەی باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی

باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی و ڕۆژی زیندبوونەوە فەلسەفە و حیکەتی خۆی هەیە و کاریگەری گەورەی هەیە لەسەی ژیانی تاکەکان، لەوانە:

١. هەستکردن بە چاودێری و لێپرسینەوە و لێپیچینەوە، وەک خودای گەورە دەفەرموویێت: ((فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ)).[١] واتە: ((جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێر و چاکەی ئەنجام دابێت، دەیبینێتەوە)).

((وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ)).[٢] واتە: ((ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕ و خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە.))

٢. دامەزرانی بیروباوەڕ بە دادگەری خودای گەورە.

٣. هاوسەنگی پاراستن لە نێوان دونیا و قیامەتتدا.

٤. ڕاستکردنەوە و ڕێکخستنی ڕەوشت و سلوک.

٥. بڵاوکردنەوەی ڕووحی هاوکاری و یارمەتیدانی یەکتری.

٦. ژیان بە هیواو ئومێدەوە، کە مرۆڤ زانی ژیانی حەقیقی لێرە نییە و ئێرە کاتییە، حەتمەن بە ئومێد و هیوایێکەوە دەژییێت.

---

(١) الزلزلة ٧.

(٢) الزلزلة ٨.

٧. ئارامگرتن لەسەر ناخۆشییەکان.

٨. هەستکردن بە تەعویز و پاداشت لە بەرانبەر چاکەکان.

٩. کوشتنی خۆپەرستی و خۆخۆیی.

١٠. بڵاوکردنەوەی هەستی بەرپرسیارییێتی.

## پوختەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی

١. هەموو کەسێك زیندوو دەکرێتەوە.

٢. هیچ کەس بە ئەندازەی گەردیلەیەك ستەمی لێ ناکرێت.

٣. هەموو کەسێك کاروکردەوەکانی خۆی دەبینێتەوە.

٤. سەرەنجامی کەسە باش و چاکەکارەکان بەهەشتە، سەرەنجامی کەسە خراپەکان دۆزەخە.

٥. هەموو ئەم پرۆسەیەی لێپرسینەوە و کۆکردنەوە و حەشر و نەشر و حیساب و کیتاب لە قورئان و فەرموودە سەحیحەکاندا ڕوونکراوەتەوە.

# قەدەر و قەزا

یەکێکی دیکە لە بنەماکانی ئیمان و بیروباوەڕی ئیسلامی بریتییە لە باوەڕبوون بە قەدەر و قەزا.

**قەدەر:** بریتییە لە ئەندازە گرتن و نەخشەکێشان بۆ کارێك.

**قەزا:** بریتیە لە بڕیاردان لەسەر کارەکە و جێبەجێکردنی ئەو بەرنامە و نەخشەیە.

**چەند بنەمایەکی زۆر گرینگ بۆ تێگەیشتن لە قەدەر و قەزا:**

**١-** خوای پەروەردگار دادگەر و عادلە و دوورە لە هەموو جۆرە ستەمێك، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾.[١]

**٢-** دونیا و قیامەت بەبێ هەوڵ و کۆشش نایەتە جێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾.[٢]

---

(١) الأنبياء: ٤٧.

(٢) الأنعام: ١٥٨.

٣- خوای گەورە بەڵێنەکانی خۆی دەباتە سەر و دوورە فێڵ و درۆ و بێ بەڵێنی، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُواْ مِنْهَا جَمِيعًاۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ٣٨ ﴾.[١]

## جـۆرەکانی قـەدەر

١. قەدەر و قەزاییێك، کە پێویستە سەبری لەسەر بگری و شوکرانەبژێر بیت لە بەرامبەریدا، ناتوانی هیچ شتێك بکەی لە بەرانبەریدا و ئازاد نیت تێیدا، وەك: کوردبوونت و شێواز و شێوەی جەستەت.

٢. قەدەر و قەزاییێك کە پێویستە هەوڵ بدەی بۆ چارەسەرکردنی و نەهێشتنی، وەك: نەخۆشکەوتن.

٣. قەدەر و قەزاییێك کە ئازادی تێیدا بە کردن یان نەکردن، بەڵام بەرپرسیاری لە بەرانبەریدا، وەك هەموو ئەو فەرمان و نەهیانەی کە خودای گەورە ئاراستەی کردووین، وەك نوێژ و ڕۆژوو و دزینەکردن و ستەمنەکردن و... هتد.

---

(١) البقرة: ٣٨.

## بازنە و بوارەکانی قەدەر و قەزا:

**١.** بازنەی غەیبی و پەنهانی و لەوحولمەحفوز هی خودای پەروەدگارە (هەندێکیشی کە خودا دەیەوێت فریشتەکانیش دەزانن).

**٢.** بازنەی ئاسمان و گەردوون: قەدەر و قەزا بەدەست خودای پەرەوردگارە.

**٣.** بازنەی زەوی: قەدەر هی خودایە و قەزا هی مرۆڤە.

**٤.** بازنەی مرۆڤ: قەدەر و قەزا هی مروڤ خۆیەتی.

کەواتە ئێمە دوو بازنەمان هەیە:

**١.** چی دەکەم و چی ناکەم (ئەمە بازنەی مرۆڤە و سەربەستە تێدا).

**٢.** چی دەبێت و چی نابێت (ئەمە بازنەی خودای گەورەیە)[١].

## بنەماکانی قەدەر و قەزا:

**١.** خودای گەورە زانیاری دەربارەی هەموو شتێك هەبووە و هەیە و دەشبێت و هیچ شتێکی لێ شاراوە نەبووە و نیە و نابێت، هەوەك خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا ١٢﴾[٢].

---

(١) ئەم دابەشکارییەم لە م. ناسر سوبحانی بیستووە.

(٢) الطلاق: ١٢.

﴿ وَمَا يَعۡزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثۡقَالِ ذَرَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ٦١ ﴾.(١)

**٢.** هەر چی ڕوودەدات لە بوونەوەردا لەویستی خودای گەورە دەرناچێت، وە هەرچی بیەوێت دەیکات و هەرچیش نەیەوێت نابێت، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ٤٠ ﴾.(٢)

**٣.** ئەوەی لە بوونەوەردایە دروستکراوی خودای گەورەیە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموی:﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ٦٢ ﴾.(٣)

**هەموو شتێك لەژێر ئیرادە و ویستی خودادایە**

**«وَلَوْ شَاء رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ» (الأنعام: ١١٢).**

**«وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا اقْتَتَلُواْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ» (البقرة: ٣٥٣).**

**«وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِيا لأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا» (يونس: ٣٩).**

**«وَلَوْشَاء اللّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ» (النساء: ٩٠).**

---

(١) يونس: ٦١.

(٢) آل عمران: ٤٠

(٣) الزمر: ٦٢

«فَمَن يُرِدِ اللّهُ أَن يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلاَمِ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاء» (الأنعام: ١٢٥).

«وَلاَ يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ اللّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ» (هود: ٤٤).

«وَلَوْ شَاء اللّهُ مَا اقْتَتَلُواْ وَلَـكِنَّ اللّهَ يَفْعَلُ مَايُرِيدُ» (البقرة: ٢٥٣).

«وَلَوْلَا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَاشَاء اللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ» (الكهف:٣٩).

«وَلَوْ شِئْنَا لَآتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَاهَا» (السجدة: ١٣).

«وَمَاتَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاء اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا» (الإنسان: ٣٠).

«مَن يَشَإِ اللّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ» (الأنعام: ٣٩).

«إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ» (يس: ٨٢).

هەموو ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خودا ویست و ئیرادەی ڕەهای هەیە.

خودا هەرچی باشە و چاکە و ئاسانکارییە بۆ مرۆڤی دەوێت

«يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ» (البقرة: ١٨٥).

«مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ» (المائدة: ٦).

«وَاللّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلاً عَظِيمًا» (النساء: ٢٧).

«يُرِيدُ اللّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الإِنسَانُ ضَعِيفًا» (النساء: ٢٨).

«إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا» (الأحزاب: ٣٣).

مرۆڤ خۆی چاکە و خراپە هەڵدەبژێرێت

«بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَاطَتْ بِهِ خَطِيئَتُهُ فَأُولَـٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ» ﴿٨١ البقرة﴾

«وَالَّذِينَ آمَنُوا وَاتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَانٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَا أَلَتْنَاهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ ۚ كُلُّ امْرِئٍ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ» ﴿٢١ الطور﴾

«مَا أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُ وَمَا كَسَبَ» ﴿٢ المسد﴾

«فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ» ﴿٧٩ البقرة﴾

«تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ» ﴿١٣٤ البقرة﴾

«تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ» ﴿١٤١ البقرة﴾

«أُولَـٰئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ» ﴿٢٠٢ البقرة﴾

«لَّا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَـٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ» ﴿٢٢٥ البقرة﴾

«يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ» ﴿٢٦٧ البقرة﴾

وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١ البقرة﴾

« لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ « ﴿٢٨٦ البقرة﴾

«فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَاهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ» ﴿٢٥ آل عمران﴾

«إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ» ﴿١٥٥ آل عمران﴾

«وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ» ﴿١٦١ آل عمران﴾

«فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا» ﴿٨٨ النساء﴾

«وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُ عَلَىٰ نَفْسِهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا»

«وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ» ﴿٣٨ المائدة﴾

«وَهُوَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَفِي الْأَرْضِ ۖ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ» ﴿٣ الأنعام﴾

«...بِهِ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ ... مِنْهَا أُولَـٰئِكَ الَّذِينَ أُبْسِلُوا بِمَا كَسَبُوا لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ ...» ﴿٧٠ الأنعام﴾

«وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ الْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا يَقْتَرِفُونَ» ﴿١٢٠ الأنعام﴾

«وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ» ﴿١٢٩ الأنعام﴾

«يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ» ﴿١٥٨ الأنعام﴾

« وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ» ﴿١٦٤ الأنعام﴾

ئەم ئایەتانە هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ خۆی کارەکانی خۆی دەکات و خۆی چاکە و خراپە هەڵدەبژێرێت و دەستیاندەخات و خۆشی لێیان بەپرسە، کەواتە هەموو ئەم ئایەتەنە دژی ئەو بۆچوونە جەبرگەرایەن کە پێیوایە خودا هەموو شتێك بە مرۆڤ دەکات.

## کوفر و بێباوەڕی لە قورئاندا پاڵدراوە بۆلای مرۆڤ خۆی

ئەگەر سەیری قورئان بکەین بکەر و فاعیلی کوفر و بێباوەڕی و شیرك و ... مرۆڤ خۆیەتی، کەواتە بە ئازادی خۆی هەڵیبژاردووە.

«الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ أُولَٰئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمَن يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ». البقرة ١٢١

«لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ». البقرة ٢٥٦

«إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ». آل عمران ١٩.

«يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا». النساء ١٣٦.

«وَمَن يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ». المائدة ٥.

«فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لَّا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ». المائدة ١١٥.

«وَلَوْلَا أَن يَكُونَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِالرَّحْمَٰنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ». الزخرف ٣٣.

کەواتە ئەگەر بە وردی بڕوانینە قورئان، دەبینین (کفر، فسق، ظلم، قتل، ....) پاڵدەدات بۆلای مرۆڤ خۆی، بەم پێیە ئەوە مرۆڤە ستەم و زوڵم و کوشتن و خراپەکاری دەکات، ئەوە مرۆڤە کوفر و بێباوەڕی و ملهوڕی و لادان و ... هەڵدەبژێرێت، هەر کەسێکیش لەخۆی وردبێتەوە زۆر بەباشی ئەوە دەزانێت کە مرۆڤ ئازادە و ئیرادە و ویست و ئازادی و عەقڵی هەیە، ئینجا هەموو شتێکیشی بۆ ڕوونکراوەتەوە، هەرکاتێکیش ئەمانەی نەما ئیدی تەکلیفی لەسەر نامێنێت.

## خودا بە ئەندازەی گەردیلەیەك ستەم ناكات

«شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لا إِلهَ إِلاّ هُوَ وَالْمَلائِكَةُ وَأُولُوا الْعِلْمِ قائِماً بِالْقِسْطِ» [ آل عمران: ١٨ ]

«وَنَضَعُ الْمَوازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيامَةِ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً» [ الأنبياء: ٤٧ ]

«إِنَّ اللّهَ لا يَظْلِمُ النّاسَ شَيْئاً وَلكِنَّ النّاسَ أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ» [ يونس: ٤٤ ]

«فَما كانَ اللّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلكِنْ كانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ» [ التوبة: ٧٠ ]

«وَما ظَلَمْناهُمْ وَلكِنْ كانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ» [ النحل: ١١٨ ]

«إِنَّ اللّهَ لا يَظْلِمُ مِثْقالَ ذَرَّةٍ» [ النساء: ٤٠ ]

«وَلا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَداً» [ الكهف: ٤٩ ]

«وَأَنَّ اللّهَ لَيْسَ بِظَلاّمٍ لِلْعَبِيدِ» [ الأنفال: ٥١ ]

«وَما رَبُّكَ بِظَلاّمٍ لِلْعَبِيدِ» [ فصّلت: ٤٦ ]

«وَمَا اللّهُ يُرِيدُ ظُلْماً لِلْعالَمِينَ» [ آل عمران: ١٠٨ ]

«وَما ظَلَمْناهُمْ وَلكِنْ كانُوا هُمُ الظّالِمِينَ» [ الزخرف: ٧٦ ]

«وَما ظَلَمَهُمُ اللّهُ وَلكِنْ كانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ» [ النحل: ٣٣ ]

لە فەرموودەشدا هاتووە:

((يا عبادي إنيِّ حرَّمتُ الظلمَ على نفسي وجعلتُه بينكم محرَّمًا، فلا تظَّالموا)). أخرجه مسلم ٢٥٧٧.

((خودای گەورە دەفەرمووێت: ئەی بەندەمەکانم: من زوڵم و ستەمم لەسەر خۆم حەڕام و قەدەغە کردووە و لەسەر ئێوەشم هەر حەڕام و قەدەغە کردووە، بۆیە زوڵم و ستەم لە یەکدی مەکەن)).

هەموو ئەم ئایەت و فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خودا بەهیچ جۆرێ ستەم ناکات و دادگەری ڕەهایە، لەوە زیاتر چی بفەرمووێت: زوڵم و ستەمم لەسەر خۆم حەڕام و قەدەغە کردووە!

## هەندێ پرسیار دەربارەی قەدەر و قەزا

پرسیار: خودای گەورە خەڵکی گومڕا دەکات؟ هەروەك دەفەرموێت: خودا کێی مەبەست بێت گومڕای دەکات و کێشی مەبەست بێت هیدایەتی دەدەت؟﴿ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ ﴿٣١﴾ ﴾.[١]

وەڵام: نەخێر خودای گەورە کەس گومڕاناکات مەگەر بۆ خوی بیەوێت و لە ڕاستی لابدات و ستەم لە خۆی بکات، ئەوکات خودای گەورە ڕێی دەدات و ویست و تواناشی پێ دەبەخشێت بۆ ئەوەی بەسەربەستی بڕیاربدات، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾.[٢]

﴿ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾.[٣]

﴿ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ ﴾.[٤]

---

(١) المدثر: ٣١

(٢) البقرة: ٢٦

(٣) غافر: ٧٤

(٤) إبراهيم: ٢٧

﴿ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾.[1]

﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾.[2]

﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾.[3]

**پرسیار:** ئایە خودای گەورە بە گوناهو تاوان و خراپە ڕازیە؟ ئەگەر پێی ڕازی نیە ئەی چۆن مرۆڤ دەتوانێت ئەنجامی بدات؟

**وەڵام:** نەخێر بەهیج شێوەیەك پێی ڕازی نیە و پێشی خۆش نیە، بەڵام ویست و حەز و ئارەزوو و توانا و عەقڵ و...... داوە بە ئینسان و ئیزنی داوە، بۆ ئەوەی بەویستی خۆی مامەڵە بکات، بەڵام دەبێت ئەوە بە باشی بزانین کە هەموو ئەمانە لە ژێر ویست و دەسەڵاتی خودای گەورە دەرناچن، چونکە خۆ ئەو کەسە کە دەتوانێت ئەم کارە بکات ئەوە بەئیزنی خودایە، چونکە خۆ ئەگەر خودای گەورە ئیزن و ویست و حەز و ئارەزوو و توانا و عەقڵ و...... نەداتێ، ئەوە ناتوانێت هیچ کارێك بکات بە چاك و بە خراپەوە.

**پرسیار:** ئایا گۆڕان بەسەر ئەو قەدەرەدا دێت کە مەلائیکەتەکان نوسیویانە؟ چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.)

---

(١) النحل: ٣٣

(٢) البقرة: ٢٥٨

(٣) التوبة: ٢٤

دەفەرموێت: قەدەر لەلایەن مەلائیکەتەکانەوە دیاری دەکرێت کاتێك مروڤ لەناو سکی دایکیدایە؟

**وەڵام:** بەڵێ بەدڵنیاییەوە گۆڕانی بەسەردا دێت ئەگەر هەوڵی بۆ بدات و هۆکارەکان بگرێتە بەر، ئەمەش بە بەڵگەی قورئان و سوننەت دەسەلمێنرێت، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ ٣٩ ﴾

﴿ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ ٧ ﴾ إبراهيم: ٧

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ٦٠ ﴾ غافر: ٦٠

هەروەها پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دەفەرموێت: (لا يرُدُّ القضاءَ إلا الدعاءُ، ولا يزِيد العُمُرَ إلا البرِّ)[١].

کەواتە بەکورتی: مرۆڤ لە شتێکدا بەپرسە کە توانا و ئازادی و عەقڵ و ئیرادە و ویستی هەبێت تێیدا، هەر شتێك بەم شێوەیە نەبێت لێی بەرپرس نییە و لێپرسینەوەی قیامەتی لەگەڵدا ناکرێت. وە مرۆڤیش لە خوی خۆیدا هەست بە توانا و ئازادی و عەقڵ و ئیرادە و ویست دەکات ناتوانێت نکۆڵی لێبکات. کەواتە مرۆڤ ناتوانێت دوای توانا و ئازادی و عەقڵ و ئیرادە و ویست و گەیشتنی پەیامی خوایی پێی بەهانە بگرێت و بڵێت من لە چارەم نووسراوە یان... !!! ئایا ئەو کەسانەی ئەو بەهانانە دەگرن ڕازی

---

(١) أخرجه الترمذي وابن ماجه والامام أحمد والطبراني وابن ابي شيبه وابن حبان والطحاوي والبيهقي وابي حاتم.

دەبن لێیان بدرێت یان بکوژرێن یان ماڵ و سامانیان لێ ببرێت یان بەند بکرێن یان... بە بیانووی ئەوەی لەچارەیان نووسراوە؟!!! ئەگەر وابێت دەبێ هەر کەسێك قسەی وا بکات و ئەو بەهانانە بگرێت هەرگیز هیچ گلەییەك نەکات لەوشتانەی بەرامبەری دەکرێت!

## فەلسەفە و حیکمەتی باوەڕبوون بە قەدەر و قەزا

**١.** ئازایەتی و چاونەترسی و بوێری و دلێری و نەترسان لە ژیان و ئاستەنگەکانی، مرۆڤ کە زانی هەموو شتێک لەژێر دەستەڵات و ویست و ئیرادەی خودادایە، ئیدی لە هیچ شتێک ناترسێ و دەبێتە کەسێکی چاونەترس.

**٢.** پشتبەستن بە خوای گەورە، مرۆڤ کە زانی هەموو شتێک لەژێر دەستەڵات و ویست و ئیرادەی خودادایە، ئیدی پشت تەنها بە ئەو دەبەستێت.

**٣.** باوەڕبەخۆبوون، مرۆڤ کە زانی هەموو شتێک لەژێر دەستەڵات و ویست و ئیرادەی خودادایە، ئیدی باوەڕی بەخۆی دەبێت و هەموو ئەو وەهمانەی وای لێدەکەن تەمبەڵی بکەن و ورەی بشکێنن وەلایان دەنێت و باوەڕبوون بەخودی لەلا دروستدەبێت.

**٤.** دەربازبوون لە شیرک و هاوبەشدانان بۆ خودا، مرۆڤ کە زانی هەموو شتێک لەژێر دەستەڵات و ویست و ئیرادەی خودادایە،

ئیدی کەسی دیکە بە هۆکاری سەرەکی شتەکان نازانێت و کەس ناهێنێتە ڕیزی خودا و هیچ عیبادەتێکیش لەبەر کەس ناکات، هەموو مەبەستەکانی دەبنە ڕەزامەندی خوای گەورە.

**٥.** دامەزراوی بەرامبەر ستەمکاران و بەدکاران و بەرهەڵستی کردنیان، مرۆڤ کە زانی هەموو شتێک لەژێر دەستەڵات و ویست و ئیرادەی خودادایە، کە زانی ڕزق و ڕۆزی و تەمەن و ... لەژێر دەستەڵاتی خودادایە، ئیدی سڵ لە هیچ شتێک ناکات.

**٦.** ئارامگری، مرۆڤ کە تووشی بەڵا و موسیبەت و نەهامەتی و نارەحەتی و ناخۆشی و نەخۆشی و لەدەستدانی ئازیزان و .... دەبێتەوە، ئەگەر بڕوای بە قەزا و قەدەر نەبێت، بەیەکجاری لە خەفەتان دەمرێت و زۆرجار تووشی خۆکوشتن و خەمۆکی و نەخۆشی دەروونی و ... دەبێتەوە.

**٧.** قەناعەت و ڕازیبوون بە بەشی خۆت، مرۆڤ کە هەوڵی تەواوی داو، هەموو ڕێکار و ڕێگەکانی گرتنەبەر، بەڵام لەوە زیاتری نەهاتە دەست، یان کەم دەرامەت بوو، لە حاڵەتی باوەڕبوونی بە قەدەری خوایی و بەشی خوایی دڵی ئاسوودە دەبێت و خەفەتی لێ ناخوات، وەک کەسانێک نیە کاتێ تووشی زیانێکی ماددی دەبن، یان ئەوەی دەیانەوێت نایەت بەدەستیانەوە ڕاستەوخۆ خۆیان دەکوژن، یان تووشی نەخۆشی دەروونی دەبن یان ...

**٨.** عیززەت و سەربەرزی لەبەرامبەر پێداویستییەکانی ژیان، کە مرۆڤ زانی هەموو شتێ لە ژێر دەستەڵات و ویست و ئیرادەی

خودادایە، کە زانی ڕزق و ڕۆزی و ... لە ژێر دەستەڵاتی ئەودایە، ئیدی بەعیززەت دەبێت و سەر شۆڕ ناکات بۆ مرۆڤەکان، نموونەشمان یەکجار زۆرە لەو بارەیەوە، بەڵام لەبەر درێژبوونەوە ناتوانین باسی بکەین.

**٩.** لەناوبردنی سیفەت و ئاکارە ناپەسەندەکان، کە مرۆڤ زانی خودا زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا، هەموو شتێک لە ژێر ڕکێفی ئەوە، ئیدی ئیرەیی و حەسوودی بە کەس نابات، لەسەر شتی نامەعقول ڕقی لە کەس نابێتەوە، ... .

**١٠.** سوپاسگوزاری بەرامبەر خودا، کە مرۆڤ لە قەزا و قەدەر بەباشی تێگەیشت، ئیدی دبێتە کەسێکی سوپاسگوزار و شوکرانەبژێر و بە وەفا، داندەنێ بە فەزڵ و کەرەم و بەخششەکانی خودا، چونکە چاک دەزانێ کە هەموو شتێک لەژێر دەستەڵاتی ئەوە و هیچ شتێ بەبێ ئەو ناکرێ و نابێ.

## تایبەتمەندییەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی

١- بیروباوەڕێکی خوداییە.

٢- بیروباوەڕێکی فیترەتیی پاکە.

٣- بیروباوەڕێکی ڕوونە.

٤- بیروباوەڕێکی بەڵگەدارە.

٥- بیروباوەڕێکی مامناوەندە.

٦- بیروباوەڕێکی کردەییە (عەمەلیە).

٧- بیروباوەڕێکی گشتگیرە.

### ١- بیروباوەڕێکی خوداییە

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی خودایی بوونە (الربانية).

### أ- ڕەببانیە لە ڕووی سەرچاوە و ڕێبازەوە

چونکە سەرچاوەکەی وەحی خودای گەورەیە بۆ کۆتا پەیامبەر محمد (درووودی خودای لەسەر بێت.) کە خۆی لە وتە و کەلامی خودای گەورەدا دەبینێتەوە، ناتەواوی تێدا نییە لە هیچ لایەکەوە، هەروەها خۆی لەسونەتی پێغەمبەردا (درووودی خودای لەسەر بێت.) دەبینێتەوە کە ڕوونکەرەوەی قورئانە.

کەواتە بیروباوەڕێکی ڕەبانی تەواوی بێ کەموکوڕییە، هیچ کەم و زیادەییێك قبووڵ ناکات، هەروەها بەشێوەیەك چەسپاو و تۆکمەیە کە قبووڵی دەستکاریکردن و گۆڕانکاریکردن ناکات، واتا هیچ فەرمانڕەوا و کۆمەڵەیەکی زانستی و کۆنگرەیەکی دینی بۆی نییە زیاد و کەمی تێدا بکات.

## ب- هەواڵدانە لەبارەی ڕاستیەکانی بوون و پەروەردگاری بوون

بیروباوەڕی ئیسلامی بریتی نییە لەو (ئینشا)[1]یەی کە لەزانستی لۆژیك و ڕەوانبێژی و بەلاغەدا هەیە، بەڵکوو بریتیە لە هەواڵدان، چونکە بریتییە لەکۆمەڵە هەواڵێك لەبارەی بابەتە مەزنەکان لە بوون: دەربارەی خودای گەورە و ناو وسیفەتەکانی، هەروەها دەربارەی جیهانە نادیارەکان کە بە هەستەکانمان درك ناکرێن و عەقڵمان وردەکاری لەبارەوە نازانێت.

جا کەسیش ناتوانێت هەواڵ لەبارەی ئەو بابەتانە بدات جگە لە کەسێك کە بەتەواوی درك و هەستیان پێدەکات و عیلم و زانستی تەواوی پێیان هەیە، ئەویش خودای گەورەیە. بەڵام مرۆڤەکان تایبەتمەندیان لە بواری ئەو شتە نادیارانەوە نییە.

---

(١) ئینشا بریتییە لە ئسلوبی داواکاری (داخوازی) وەکوو: داخودازیکردنی کارێك یان نەکردنی یان پرسیار کردن یان بانگکردن، واتا ڕستەی هەواڵدان نەبێت.

### ج- سەلامەت و پارێزراوە لە گۆڕان و دەستکاریکردن

بیروباوەڕی ئیسلامی تاکە بیروباوەڕە لە جیهاندا کە سەرچاوەکەی وتەی پەروەردگارە، نە گۆڕاوە و نە دەستکاریکراوە و نە لەگەڵ خەیاڵ و هەڵە و پەڵەی بەندەکان تێکەڵ بووە.

ئەو بیروباوەڕانەی ئەمڕۆ دەستیان بەسەر جیهاندا گرتووە جگە لەئیسلام سێ بیروباوەڕن:

١- بیروباوەڕێکی گۆڕدراو: ئەگەر لە بنەڕەتیشدا لە لای خودای گەورەوە هاتبێت، لەدواییدا دەستی گۆڕین و زیادکرن و کەمکردنی پێ گەیشتووە. جا هەندێك شتیان بۆزیادکردووە کە تێیدا نەبووە، هەندێك شتیشیان لێ کەمکردووەتەوە کە تێیدابووە، یان قسەی خودای گەورەیان لەگەڵ قسەی خەڵکی تێدا تێکەڵ کردووە، بۆیە هیچ متمانەیەك نەماوە لەوەی سەرچاوەی ئەو بیروباوەڕە لەلای خودای گەورەوە بێت، ئەوەش وەکوو ئایینی جوولەکە و مەسیحی.

٢- بیروباوەڕێکی ئایینی مرۆیی: وەکوو ئایینی بوزی لە چین و یابان و هیند، کە هیچ بنەڕەتێکی ئاسمانی نییە، سەرچاوەکەشی ئەندێشەی مرۆڤە.

٣- ڕێبازێکی مرۆیی تەواو: سەرچاوەکەی ئەندێشەی ئەقڵ و فەلسەفەی مرۆڤێك یان کۆمەڵە مرۆڤێکە، وەکوو ڕێبازی شیوعی کە لەماوەیەکی کەمدا پوکایەوە، یان ڕێبازی سەرمایەداری و وجودی و ئەوانیتر.

بەڵام بیروباوەڕی ئیسلامی ئەو بیروباوەڕەیە کە سەلامەتە لە هەموو دەستکاری کردن و دەستوەردانێکی مرۆڤ، چونکە خودای گەورە خۆی پاراستنەکەی گرتۆتە خۆ، وەك دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ۝٩ ﴾.[١] واتا: ((بەڕاستی ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و هەر بۆخۆشمان دەیپارێزین.))

## د- ئامانج و مەبەستی خودایە:

هەروەکوو چۆن سەرچاوە و ڕێبازی بیروباوەڕی ئیسلامی لەلایەن خوداوەیە، بە هەمان شێوە ئامانج و مەبەستیشی خودای گەورەیە، چونکە ڕۆژی دوایی دەکاتە ئامانجی مرۆڤ، هەروەها ئامانجە دوورەکەی بریتییە لە پەیوەندی باش و پتەو لەگەڵ خودای گەورەدا و بەدەستهێنانی ڕەزامەندییەکەی، بۆ ئەوەی ببێتە بەندەیەکی نیەتپاك لەگەڵ خودای گەورەدا. ئەوەش بریتییە لە واتای تەوحید و یەکتاپەرستی: بەتەنها خوداپەرستن، هەروەها کەس نەکرێت بەهاوبەشی.

## ٢- بیرەباوەڕێکی فیترەتییە (گونجاوە لەگەڵ فیترەت)

بیروباوەڕی ئیسلامی هەماهەنگە لەگەڵ سروشت و فیترەتی پاك، بەڵام ئایینەکانی تری وەکوو جوولەکە و دیانەکان و مەجوسییەکان ئەوانە بەزارەکی لە باب و باپیرانەوە وەرگیراوە و لەژێر کاریگەری ژینگەدایە، ئەوەش چەند نموونەیەك لەسەر

---

(١) الحجر: ٩.

**هەماهەنگی بیروباوەڕی ئیسلامی لەگەڵ فیترەت و سروشتی پاکدا:**

**نموونەی یەکەم: بوونی خودای گەورە و تاك و تەنها:** مرۆڤ بە سروشتی پاکی خۆی دەزانێت کە ئەو گەردوونە خودایەکی هەیە، جا ئەگەر ئەو سروشتە بەدی نەکرێت و دەرنەکەوێت لەکاتی گاڵتە و خۆشیدا، ئەوە لە کاتی ناخۆش و تەنگوچەڵەمەدا دەردەکەوێت.

ئەگەر بێتو مرۆڤ بە سروشت و دەروونی خۆی بڕیار بدات بێ ئەوەی بکەوێتە ژێر هیچ کاریگەریەکی دەرەکی، ئەوە دان بە بوون و تەنهایی خودای گەورەدا دەنێت.

**نموونەی دووەم: باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی:** باوەڕبوون بە ڕۆژی دوایی سروشتێکە کە خودای گەورە داویەتی بە مرۆڤ و لەسەر ئەو سروشتەش دروستیکردووە، ئەوەتا هەموو مرۆڤێك لە ناخی خۆیدا هەست بەوە دەکات کە تەنها بۆ ئەو ژیانە و ئەو ماوە کورتە دروست نەکراوە.

## ٣- بیروباوەڕێکی ڕوونە

بیروباوەڕی ئیسلامی بیروباوەڕێکی ڕوونە و هیچ ئاڵۆزی و ناڕوونییەکی تێدا نییە. لەگەڵ هەموو مرۆڤەکاندا دەگونجێت، هەموو ئاستە ئەندێشەیی و کۆمەڵایەتیەکان قەناعەت پێ دەکات، ئەوەش چەند نموونەیەك لەسەر ڕوونی ئەو بیروباوەڕە:

**نموونەی یەکەم: بیروباوەڕی ئیسلامی لەبارەی خودای گەورە:**

**پوختەی ئەو بیروباوەڕە لەبارەی خودای گەورە ئەوەیە کە باوەڕت بە بوونی خودای گەورە هەبێت، هەروەها ئەو گەردوونە داهێنەرێك و ڕێکخەرێکی هەیە کە دروستی کردووە و ڕێکی خستووە و هەموو شتێکی تێدا داناوە.**

**بەراوردێك:**

**أ- ئەو ڕوونی و ئاشکراییيە لەکوێ و بیروباوەڕی بەسێ کردن (التثلیث)[1] لەلای وەسەنییە کۆنەکان، یان بیروباوەڕی دیانەکان لەکوێ کە بەو وەسەنیەتە کاریگەر بوون و یەك خودا دەکات بە سێ خودا و سێ خوداش بەیەك خودا، دەڵێن: باوك و کوڕ و ڕووحی پاك یەك خودان! ئەوەش پێچەوانەی ئەقڵە و ئەقڵ سەرگەردان دەکات و داوای بیروباوەڕێکی مەحاڵ لەخۆی دەکات؟**

**ب- ڕوونی و ئاشکرایی بیروباوەڕی ئیسلامی لەکوێ و بیروباوەڕی جوولەکەکان لەکوێ کە دەڵێن: عوزێر کوڕی خودایە، یان ئەوانەی جەستە بۆ خودای گەورە بڕیاردەدەن و بەشێوەیەك قسە لەبارەی خودای گەورە دەکەن وەکوو ئەوەی مرۆڤێك بێت؟**

---

(١) واتا: بیروباوەڕی ئەوانەی دان بە بوونی سێ خودا دەنێن (باوك وکوڕ و ڕووحی پیرۆز) (الله، عیسی، مریم).

ج- ڕوونی و ئاشکرایی بیروباوەڕی ئیسلامی لەکوێ و بیروباوەڕی وەسەنییەکان[١] لەکوێ کە خۆر و بەرد و مرۆڤ و مانگا دەکەن بە خودا ؟

نموونەی دووەم: بیروباوەڕی ئیسلامی لەبارەی خودی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.)

بیروباوەڕی ئیسلام لەبارەی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێت.) ڕون و ئاشکرایە هیچ ناڕوونی و تێکەڵی و بانگەشە و ئەفسانەیەکی تێدا نییە. بریتییە لە مرۆڤێك خودای گەورە هەڵیبژاردووە و تایبەتی کردووە بە وەحی و نیگای خۆی.

فریشتەش نییە و شتە بەپەنهانەکانیش نازانێت ئەوەندە نەبێت کە خودای گەورە پێی گوتووە و پێی ڕاگەیاندووە، هیچ دەستێکیشی نییە لە بەڕێوەبردنی گەردوون، تەنها گەیەنەری پەیامەکانی پەروەردگاریەتی.

بەراوردێك:

أ- ئەو ڕاشکاویی و ڕوونییە لەکوێ و قسەی دیانەکان لەکوێ لەبارەی کەسایەتی پێغەمبەر عیسا و ئەو سیفەتانەی دەیدەنە پاڵ و دەڵێن: ئەو خودایە و کوڕی خودایە و یەکێکە لە سێ خودایەکە ؟!

---

(١) ئەوانەی پەیکەری ئاژەڵ و مرۆڤ دەپەرستن

دیانەکان کەسایەتی مەسیحیان لەلا ڕوون نییە، تا ئەو ڕادەیەی چەندین ناوەندی توێژینەوەیان پێکهێناوە بۆ ئەوەی لە سروشتی بکۆڵنەوە کە ئایا خودایە؟ یان کوڕی خودایە؟ یان مرۆڤێکی تەواوە؟ یان مرۆڤە و خودایەتی تێیدا تواوەتەوە؟ یان بەشێکە لە سێ بەش و کەسە سەرەکیەکەیە کە خودای لێ پێکدێت: باوك و کوڕ و ڕووحی پاك؟ هەروەها لە خودی ڕووحی پاکدا ناکۆکن کە بریتییە لە چی؟ پەیوەندی بە دوو بەش و کەسە سەرەکیەکەی ترەوە چییە؟ یان دایکی مەسیح کێیە؟ بەشی ئەو چییە لە خودایەتی و مرۆڤیەتی ؟

ب- ئەو ڕوونییەی ئیسلام لەکوێ و قسەی جوولەکەکان لەکوێ کە لەبارەی یەعقوب (علیە السلام) چەندین ئەفسانەیان هەیە دەڵێن: زۆرانبازی لەگەڵ خودا گرتووە (پەنا بەخودا)، ئینجا سەریشکەوتووە بەسەریدا.

ج- یان ئەو هەموو جیاوازیەی هەیە لەنێوان ئەو ڕاشکاوی و ڕوونییەی ئیسلام و ئەو چیرۆکە ئەفسانەیی و خوڕافیانەی کە لەو تەوڕاتەی ئێستادا هەیە.

نموونەی سێیەم: بیروباوەڕی ئیسلامی لەبارەی بەرپرسیاریەتی و پاداشت و سزا:

بیروباوەڕی ئیسلامی بەڕوونی بڕیار لەسەر بەرپرسیاریەتی مرۆڤ دەدات لەبەرانبەر کردەوەکانی، بۆیە نە هیچ کوڕێك دەکەوێتە ژێرباری تاوانەکانی باوکی و نە هیچ برایەك باری تاوانی

براکەی هەڵدەگرێت، هەموو کەس بارمتەی کردەوەکانیەتی و وابەستەی گوناهەکانیەتی.

بەراوردێك: ئەو دادپەروەریە لەکوێ و بیروباوەڕی دیانەکان لەکوێ کە دەڵێن: تاوانی باوکمان ئادەم (کە خواردنی دارەکە بوو لە بەهەشت) لەسەر شانی نەوەکانی بوو لە دوای خۆی تا ئەوکاتەی مەسیح هات و خۆی خستە بەردەم لەخاچدان (صلب) وەکوو قوربانییێك بۆ سڕینەوە و لادانی تاوانی ئادەم لەسەر شانی نەوەکانی، بۆ ئەوەی پاکیان بکاتەوە لەو تاوانە و دەربازیان بکات.




## بیروباوەڕی ئیسلامی خاوەن بەڵگە و بوڕهانە

یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی ئەوەیە کە هەماهەنگە لەگەڵ عەقڵ و پشت ئەستووروە بە بەڵگە، هەر بە عەقڵ دروستی حوکمەکانی دەردەکەوێت، نەك سەپێنەر بێت لە حوکم و بابەتەکانیدا.

ئەوەش چەند بەڵگەیەکی عەقڵی کە قورئان دەیانخاتەڕوو سەبارەت بە بابەتە گەورەکانی عەقیدە و بیروباوەڕ:

### أ- بوونی خودای پەروەردگار:

ئەو بەڵگەیەی کە قورئان دەیخاتەڕوو لەسەر بوونی خودای گەورە ئەو دەقەی قورئانە کە دەفەرمووێت: ﴿أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ٣٥ أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ٣٦﴾.[1]. واتا: ((ئایا مرۆڤ لەخۆیەوە دروست بووە یان خۆیان خۆیانیان دروستکردووە، یان ئەوان ئاسمان و زەویان دروستکردووە.))

جا مەحاڵە لە خۆوە دروستبووبن، چونکە ئەوە پێچەوانەی یاسای هۆکارە (السببیە) کە بریتییە لەوەی هەموو شتێك هۆکاری خۆی هەیە و هەموو دروستکراوێك دروستکاری هەیە کە ئەوە

---

(١) الطور: ٣٥ – ٣٦.

بیروباوەڕێکی سروشتی و عەقڵییە و کەس ئینکاری لێ ناکات. جا کە لە خۆوە دروست نەبووبن، ئەوە هەر ناکرێت خۆیان خۆیانیان دروستکردبێت، چونکە دروستکراو خۆی دروست ناکات، چونکە شتی دروستکراو بەرلەوەی دروست بکرێت هیچ شتێك نییە شتێکیش کە بۆخۆی نەبێت بوونی پێ بەدی نایەت.

هەروەها مەحاڵە ئەوان ئاسمان و زەویان دروستکردبێت چونکە بەرلەوەی ئەوان بێنەبوون و دروستببن ئەو ئاسمان و زەمینە هەر هەبووە، بۆیە هیچ کەسێك ناتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات و بڵێت کە ئەو دروستی کردوون.

## ب- تاکیەتی خودای پەروەردگار:

ئەو بەڵگەیەی کە قورئان هێناویەتیەوە لەسەر تاکیەتی خودای پەروەردگار بریتییە لەو دەقەی کە دەفەرمووێت: ﴿لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ٢٢﴾.[1] واتا: ((ئەگەر جگە لە خودای تاك و تەنها خودای تر هەبووایە، ئەوا گەردوون تێك دەچوو و ململانێ ڕوویدەدا.))

﴿مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٖ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنۡ إِلَٰهٍۚ إِذٗا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهِۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ٩١﴾.[2] واتا: ((خودای گەورە هیچ منداڵی نییە و هەرگیز

---

(١) الأنبياء: ٢٢.

(٢) المؤمنون: ٩١.

هیچ خودایەکی تری لەگەڵ نەبووە. ئەگەر وا بووایە، ئەوکاتە هەرخودایەك دەچووە لای دروستکراوەکانی خۆیی و گرنگی پێ دەدا، هەروەها هەندێکیان خۆیان بە گەورەتر دەبینی لە هەندێکی تریان، پاك و بێگەردی و گەورەیی بۆ خودای تاك و تەنها لەو وەسفەی کە دەیکەن.

## ج- دابەزاندنی پەرتووکی ئاسمانی و ناردنی پەیامبەران:

هەروەها ئەو بەڵگە عەقڵییەی کە قورئان دەیخاتەڕوو لەسەر ناردنی پەیامبەران و دابەزاندنی پەرتووکەکان، ئەو دەقەیە کە دەفەرموویت:﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ قُلۡ مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ تَجۡعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبۡدُونَهَا وَتُخۡفُونَ كَثِيرٗاۖ وَعُلِّمۡتُم مَّا لَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنتُمۡ وَلَآ ءَابَآؤُكُمۡۖ قُلِ ٱللَّهُۖ ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِي خَوۡضِهِمۡ يَلۡعَبُونَ ٩١ ﴾

خودای گەورە ڕوونی دەکاتەوە کە مرۆڤەکان کاتێك دەڵێن: خودای گەورە پەیامبەر و پەرتووکی نەناردووە بۆ بەندەکانی بەو قسەیان ناحەقیان کردووە و حەقی پەروەردگاریان نەداوە، ڕێز و قەدری تەواویان نەداوە بە خودای گەورە، چونکە بەڕەهایی ڕەتی دەکەنەوە کە خودای گەورە هیچ پەیامبەر و پەرتووکێکی ناردبێت، لە کاتێکدا خودای کاربەجێ بەندەکانی فەرامۆش ناکات، ئاوا بەبێ ئامانجی دەستبەرداریان نابێت، بێ ئەوەی بەرنامەیەکیان بۆ

بنێرێت و پێغەمبەرێکیان بۆ بنێرێت کە نێوەندگیریان بکات لەو بابەتانەی کە ناکۆکن تێیدا.

## د- زیندووکردنەوە و وەرگرتنەوەی پاداشت و سزا (بەپێی کردەوەکان)

قورئان چەند بەڵگەیەکی هێناوە لەبارەی دروستی زیندووکرنەوە و وەرگرتنی جەزای دادپەروەرانە بەپێی کردەوەکان، لەوانە:

١- دروستکردنی بوونەوەر لە نەبوونەوە: خودای گەورە دەفەرموێت:﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ﴾ الروم: ٢٧. واتا: ((خودای گەورە ئەو زاتەیەکە بوونەوەر لە نەبوونەوە دروست دەکات، پاشان دووبارە دوای مردنیان زیندوویان دەکاتەوە کە دیارە ئەوە بەلایەوە ئاسانتریشە.))

ئەوە پێوانەیەکی سەرەتایی عەقڵیە کە قورئان دەیهێنێتەوە بۆ دروستی زیندووبوونەوەی جەستەکان و وەڵامدانەوەی ئەوانەی ئینکاری لەو بابەتە دەکەن و دەڵێن شتێکی مەحاڵە.

باشە دروستکردن لە نەبووەوە قورسترە یان دروستکرنەوەی دوای دروستکردن؟!

باشە کەسێک بتوانێت لە نەبووەوە بێنێتە بوون، چۆن ناتوانێ جارێکی تر بیهێنێتەوە بوون؟

ئەگەر وابێت، نابێت بێباوەڕەکان باوەڕیان بە خۆشیان هەبێت، چونکە نەك ئەوان بەڵکوو هەموو بوون و گەردوون لە نەبووەوە

پەیدابووە، وەك زانستی فیزیا نەبوویی و سەرەتایی بوون و گەردونی سەلماندووە.

**٢-** دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی: پاشان سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ بەڵگەیەکی دی، کە ئەویش دروستکردنی ئەو گەردوونە مەزن و فراوانەیە:﴿ لَخَلْقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾.[1] واتا: ((دروستکرنی ئاسمان و زەوی گەورەتر و مەزنترە لە دروستکردنی مرۆڤەکان، بەڵام زۆربەی مرۆڤەکان ئەوە نازانن.))

**٣-** زیندووکردنەوە و سەوز کردنەوەی زەوی (لەدوای وشك بوون و زەردبوونی): یەکێکی تر لەو بەڵگانەی کە قورئان ئاماژەی پێ دەدات لە بارەی زیندووبوونەوە، بریتییە لە زیندووکردنەوەی ئەو زەویە کە وشك و زەرد دەبێت، کاتێك باران بەسەریدا دەبارێت دووبارە زیندوو دەبێتەوە و سەوزایی و گژوگیا دووبارە زەوی دادەپۆشێت، جا مرۆڤیش زۆر بەو زەویە دەچێت کە لێی دروستکراوە و تێیدا دەژییێت.﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾.[2]

---

(١) [غافر: ٥٧].

(٢) [فصلت: ٣٩].

٤- یەکسان نەبوونی چاکەکاران و خراپەکاران: یەکێکی تر لەو بەڵگانەی کە قورئان دەیهێنێتە بەردەمان لەسەر زیندوبوونەوە و وەرگرتنەوەی جەزای کردەوەکان بریتییە لەوەی کە نابێت چاکەکاران و خراپەکاران یەکسان ببن و وەکوو یەك بن، کە ئەوەش هەم عەقڵ و هەم فیترەت ڕەتی دەکەنەوە و بە مەحاڵی دادەنێن کە کەسی باش و کەسی لاڕێ وەکوو یەك بن و یەك ئەنجامیان هەبێت:﴿أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلۡمُفۡسِدِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلۡمُتَّقِينَ كَٱلۡفُجَّارِ ٢٨﴾.[1]

٥- بیروباوەڕی ئیسلامی بیروباوەڕێکی نێوەندگیر و مامناوەندە بیروباوەڕێکی نێوەندگیر و مامناوەندە، هیچ زیادەڕۆیی کورترەوییێکی تێدا بەدی ناکرێت، ئەوەش چەند نموونەیەك لەو بارەیەوە کە دیارترین تایبەتمەندی ئەو بیروباوەڕەیە:

### نموونەی یەکەم: باوەڕهێنان بە خودای گەورە

ئەم بیروباوەڕە نێوەندگیر و مامناوەندە لەنێوان مادییەکان کە ئینکاری بوونی خودای گەورە و هێزی پشت گەردوون و هەموو ئەو شتانەش دەکەن کە بەهەستەکانیان هەستی پێ ناکەن. فیترەتیان لە سینەیاندا خنکاندووە و تەنها لەسەر عەقڵ کۆکن، لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ئەفسانەیەی کە دەڵێن: ئەو جیهانە زیاتر لە خودایەکی هەیە، بەڵکوو دەڵێن: ڕووحی خودا لە سەرکردە و

---

(١) ص: ٢٨.

پادشاكان تواوەتەوە، بەڵكوو لە هەندێ ئاژەڵ و ڕووەك وەكوو مانگا و درەخت.

جا بیروباوەڕی ئیسلام ئەو ئینكارییەی بێباوەڕەكانی ڕەتكردووەتەوە، هەروەك چۆن فرەخودایی و هاوبەش دانانیشی ڕەتكردووەتەوە، تەنها داندەنێت بەیەك خودا كە هیچ خودایەكی ڕاست و حەق نییە جگە لەو، كەسی لێنەبووە و لە كەسیش نەبووە و هاوتاشی نییە، جگە لەو خودا تاك و تەنهایە هەرچی دروستكراوە، هیچ زیان و سوود و مردن و ژیان و زیندوكردنەوەیەكی بەدەست نییە.

نموونەی دووەم: سیفەتەكانی خودای گەورە

بیروباوەڕی ئیسلامی زیادەڕەوی تێدا نییە لە داماڵین و نەفیكردنی سیفەت لە خودای گەورە، وەكوو فەیلەسوفە یۆنانییەكان كە سیفەتەكانی خودایان داماڵی بوو، پێیان وابوو هیچ مانایەكی نییە، هیچ ئاماژەیەكی ترس و ئومێدی تێدانییە.

هەموو ئەوەی كە گوتوویانە سەبارەت بە سیفەتەكانی خودا، ئەوەیە كە دەڵێن: خودا ئاوا نییە و ئاواش نییە، بێ ئەوەی بڵێن سیفەتە ئیجابییەكانی (ئەرێنیەكان) ئەو خودایە چین؟ و كاریگەری چییە لەسەر جیهان؟

لەبەرانبەر ئەوەدا بیروباوەڕی ئیسلامی نە خودا بە هیچ شتێك دەچوێنێت (تەشبیهی ناكات بە هیچ) نە جەستەشی بۆ بڕیاردەدات، وەك چۆن هەندێ لە بیروباوەڕەكانی تر تێكەوتن وەكوو جوولەكەكان كە پێیان وایە خودای گەورە وەكوو یەكێك

لەو خەڵکە وایە، بە خەوتن و ماندووبوون و پشودان وەسفی دەکەن و دەڵێن: هەندێکجار لەگەڵ هەندێ لە پێغەمبەران بەیەك دەگەن ململانێیان لەگەڵ دەکات و جا شکست بەکتر دەهێنن و مل لەملی یەکدی دەنێن.

بەڵام بیروباوەڕی ئیسلامی خودای گەورە بە پاك و دوور دەبینێت لە سیفەتی دروستکراوەکانی:

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾[1] واتا: ((هیچ شتێك وەکوو خودای گەورە نییە، خودای گەورەش وەکوو هیچ شتێك نییە، خودای گەورە بیسەر و بینەرە (وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ)[2] خودای گەورە هەرگیز هیچ هاوتا و هاوشێوەی نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا بە سیفەتی ئیجابیە (ئەرێنی) و کاریگەرەکان وەسفی دەکات هەروەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾.[3]

### نموونەی سێیەم: پێغەمبەرایەتی

بیروباوەڕی ئیسلامی لەبارەی پێغەمبەرایەتیشەوە نێوەندگیر و مامناوەندە، نە پێغەمبەران دەگەیەنێت بە پلەی خودایەتی،

---

(١) الشوری: ١١.

(٢) [الإخلاص: ٤]

(٣) البروج: ١٢ – ١٦.

وەکوو بیروباوەڕی هەندێک لە میللەتانی تر لە بارەی پێغەمبەرانیان، وەکوو دیانەکان کە سیفەتی خودایان داوەتە پاڵ عیسا (علیه السلام)، نە داشیاندەبەزێنن بۆ ئاستی خەڵکی نەفام، جا گوناهی گەورە و کردنی کاری نەشیاو و شوێنکەوتنی هەوا و ئارەزوویان بۆ بڕیار بدات، وەکوو ئەوەی کە لەتەوراتی ئەمڕۆدایە کە بەم شێوەیە وەسفی پێغەمبەران دەکات.

لە بیروباوەڕی ئیسلامدا پێغەمبەران بریتین لە مرۆڤی پاك و هەڵبژێردراو، پێشەنگن بۆ شوێنکەوتووانی، هەروەها پارێزراون لەگوناهی گەورە و کاری قێزەون.

### نموونەی چوارەم: ویست (ئیرادە)ی مرۆڤ

بیروباوەڕی ئیسلامی لە ڕووی بابەتی ویست و ئیرادە (ناچارە لە کردنی کارەکانی یان بژاردەی لە دەست خۆیدایە) هەماهەنگ و یەکگرە لەگەڵ فیترەت و واقیعی بینراو.

مرۆڤ لە بازنەی کارە بژاردەییەکانیدا ئازادە و بەرپرسیارە لە خۆیی و لە کارەکانی. دەتوانێت ئەوەی بیەوێت بیکات و نەیکات، هەروەکوو چۆن دەیان دەقی قورئانیمان هەیە کە بەڵگەن لەسەر ئازادی مرۆڤ لە کردەوەکانی و ئەو بەرپرسیارەیەتییەی لەسەریەتی.

بەڵام مرۆڤ –وەکو لە واقیعدا دیارە- ئیرادەی ڕەهای نییە، بژاردەی تەواوی لە دەست نییە، کە هەرچی حەزی لێ بێت بیکات و ئەوەی بیەوێت ئەنجامی بدات، واتا مرۆڤ هەموو

شتێك بە ویست و ئیرادەی خۆی نییە وەكوو موعتەزیلەكان دەڵێن، لە هەموو شتێكیشدا مەجبور و ناچار نییە وەكوو جەبریەكان دەڵێن، بەڵكوو لە نێوان ئیختیار و ئیجباردایە.

چونكە لەسەرووی ئیرادە و ویستی مرۆڤ، ویست و ئیرادە و زانست و حیكمەتی خودای گەورە هەیە.

### ٦- بیروباوەڕێكی كردەییە

ئەو بیروباوەڕەی ئیسلام بڕیاری لەسەرداوە بیروباوەڕێكی كردیی ئەرێنییە، شوێنەوار لەسەر ڕەفتار جێدەهێڵێت و لە كردەوەدا دەردەكەوێت. بۆیە خودای گەورە كە لە قورئاندا باسی باوەڕ دەكات، دەیبەستێتەوە بەكردەوەوە.

ئیسلام ئەوە لە بەندەكان قبووڵ ناكات كە بیروباوەڕەكەیان تەنها بیردۆزی و نەزەڕی بێت، هەروەها باوەڕی تەنها ئەندێشە و فیكر بێت و كاریگەری نەبێت لە كردنی كاری چاك و وازهێنان لە كاری خراپ، بەڵكوو داوایان لێ دەكات كەوا خاوەن باوەڕێكی كردەیی بن و بیروباوەڕێكی ئەرێنیان هەبێت كە بەرهەمی هەبێت لە خودی خاوەنەكەیی و ژیانی خەڵكدا.

ئەوەش چەند نموونەیەكن لەسەر لایەنی كردەیی باوەڕبوون بە نادیار و پەنهانەكان (عالم الغيب):

أ- ناو و سیفەتەكانی خودای گەورە: هەموو ناوێك لە ناوەكانی خودای گەورە كە خودای گەورە خۆی پێیانی گوتووە كاریگەری

کردەیی هەیە لەسەر پاککردنەوەی نەفس و سلوکی مرۆڤ بۆ نموونە (الرقيب) چاودێر.

ب- پێغەمبەرایەتی: قورئان باسی پێغەمبەران و پەیامبەرانی بۆ کردوویین، باسکردنێك کە پاڵ بە مرۆڤی باوەڕدارەوە دەنێت بۆ ئەوەی هیدایەتیان لێ وەربگرێت و لەسەر ڕێبازیان بڕوات، ئەوەش گرینگترین ئەو تایبەتمەندیانەن کە قورئان تەئکید و دڵنیایی لێ کردووەتەوە:

١- خودای گەورە لە قورئاندا زۆر باسی سیفەتی ئەو پەیامبەرە هەڵبژێردراوانەمان بۆ دەکات: وەکوو سپاردەپارێزی و ڕاستگۆیی لە گەیاندنی پەیامەکانی خودای گەورەدا و یەکلابوونەوە بۆ خودای گەورە لە بانگەوازیدا و داوێنپاکی، خاوێنی، لەسەرخۆیی، ئارامگری، نەرمونیانی و خۆبەکەمگری.

٢- خودای گەورە باسی پشتیوانی خۆی کردووە بۆ ئەو پێغەمبەرانە بەو موعجیزانەی کە گوزارشت و دەلالەت لە ڕاستگۆیەتی ئەوان دەکەن.

٣- قورئانی پیرۆز بە وردی باسی چیرۆکی پێغەمبەران دەکات، هەروەها باسی تێکۆشانیان لەگەڵ قەومەکەیان و ئارامگریان و ئەنجامی ئەو ململانێیە دەکات، بە شێوازی دووبارە و دڵنیایی و جۆراوجۆر.

٤- قورئانی پیرۆز مافی پێغەمبەری (درووودی خودای لەسەر بێت.) لەسەر ئوممەتەکەی ڕوونکردووەتەوە لە خۆشەویستی و ئەدەب و گوێڕایەڵی و کردنی بە پێشەنگ.

ج- بیستراوەکان: لە بابەتی بیستراوەکاندا (ڕۆژی دوایی و جیهانە پەنهانەکان وەکوو فریشتە و جنۆکە) قورئان باسی ئەوانەمان بۆ دەکات بەو ئەندازەیەی کە سوودی ئێمەی تێدایە و هانمان دەدات بۆ کردنی کردەوەی چاك.

### ٧- بیروباوەڕی ئیسلامی گشتگیرە

گشتگیری بوونی بیروباوەڕی ئیسلامی

بیروباوەڕی ئیسلامی، لە هەر لایێکەوە بۆی بڕوانی گشتگیرە ئەوەش لە چوارچێوەی

**ڕوونکردنەوە و تەفسیرکردنی پرس و بابەتە مەزنەکان لەو بوونەدا (گەردوون):**

أ- ئەم بیروباوەڕە بۆیە بە گشتگیر وەسف دەکرێت، چونکە بابەت و پرسە مەزنەکانی ئەو بوونە شیدەکاتەوە و تەفسیر دەکات، ئەو بابەتانەی کە ئەندێشەی مرۆڤایەتییان سەرقاڵ کردووە، تاوەکوو ئێستاش هەرپێی سەرقاڵە و پرسیاری بۆ دروست دەبێت لەو بارەیەوە و داوای وەڵامی یەکلاکەرەوە دەکات کە ئەو وەڵامە مرۆڤ لە تیاچوون و گومان و سەرلێشێواوی دەربهێنێت، لە ژێر

پاشماوە فەلسەفیەکان و دینە تێکگیراوەکان لە کۆن و ئێستادا ڕابکێشێتە دەرەوە: وەکوو بابەتی خودا، گەردوون، مرۆڤ، پێغەمبەرایەتی، سەرئەنجام و مەصیری مرۆڤ دوای مردنی.

جا هەندێك بیروباوەڕ هەیە گرنگی داوە بە بابەتی مرۆڤ بەڵام باسی خودایەتی و یەکخودایی نەکردووە، هەیە باسی خودایەتی کردووە بەڵام بە لای بابەتی پێغەمبەرایەتیدا نەچووە، هەشە بابەتی پێغەمبەرایەتی تاوتوێ کردووە بەڵام خۆی لە بابەتی پاداشت و سزای ئەو دونیا لاداوە، بەڵام بیروباوەڕی ئیسلامی هەموو ئەو لایەن و بابەتانەی تاوتوێ کردووە و باسی کردوون و زۆر بە گشتگیریی و ڕوونی قسەی خۆی تێداکردووە.

## ئەم بیروباوەڕە (ئیسلام) هەرگیز مرۆڤ دابەشناکات لە نێوان دوو خودا:

ب- ئەو بیروباوەڕە لەوەشدا گشتگیرە، کە مرۆڤ دابەش ناکات لە نێوان دوو خودا: خودای خێر و ڕوناکی و خودای شەڕ و تاریکی، وەکوو لەناو مەجوسییەکان باو بووە، یان لە نێوان خودا و شەیتان کە لە ئینجیلدا ناوی بە (سەرۆکی ئەو جیهانە)، (خودای ئەو دونیایە)هاتووە، جیهانی لە نێوان شەیتان و خودای گەورەدا دابەشکردووە، خاوەنداری و پادشایەتی ئەو دونیای داوە بە شەیتان و هی ئاسمانەکانیشی داوە بە خودای گەورە ؟!!

### ئەم بیروباوەڕە (ئیسلام) تیشک دەخاتە سەر عەقڵ و دڵ:

لە لایەکیتریشەوە گشتگیرە ئەویش بەوەی کە: تەنها پشت بە ویژدان و هەست نابەستێت لە چەسپاندن و سەلماندنی، هەروەکوو دیانەکان کە بەشێوەیەکی بڕاوە ڕەتی دەکەنەوە عەقڵ دەست وەربداتە ناو بابەتی عەقیدە، بەڵکوو بەڕەهایی خۆت بدەیتە دەست عەقیدە و بیروباوەڕ، دەڵێن: بیروباوەڕت کوێرانە وەربگرە، لە هەمانکاتدا بیروباوەڕی ئیسلامی بە تەنها پشت بە عەقڵیش نابەستێت وەکو تەواوی فەلسەفە مرۆییەکان کە عەقڵ دەکەن بە تاکە هۆکار لە ناسینی خودا و شیکردنەوەی ماناکانی بوون، بەڵکوو پشت بە ئەندێشە و ویژدان دەبەستێت بەیەکەوە، یان عەقڵ و دڵ بەیەکەوە، چونکە دوو هۆکاری سەرەکین بۆ زانین.

بیروباوەڕی ئیسلامی بریتییە لەوەی کە لە ڕۆشنایی عەقڵ و گەرمایی دڵ هەڵدەقوڵێت، هەر ئاواش ڕۆڵی خۆی دەبینێت و بەروبووم بەرهەمدەهێنێت لەژیاندا.

### گشتگیری خودی مرۆڤ:

د- عەقیدەی ئیسلامی گشتگیرە لە کۆکردنەوەی نێوان دونیا و دوارۆژ و لە نێوان ڕووح و جەستە و بەدیهێنانی کەسایەتیەکی یەکسان و هاوسەنگ، لە کاتێکدا دەبینین عەقیدەکانی تر دەبنە هۆی دابەشبوونی کەسایەتی مرۆڤ لەنێوان داواکانی جەستە و داواکانی ڕووح، لە نێوان دەسەڵاتداری سەر زەوی و

دەسەڵاتداری ئاسمان، بەوەش خودی کەسەکە تووشی دابەشبوون و دوولایەنی و لێکبوونەوە دەبێت.

### گشتگیری بۆ نەتەوەکانی مرۆڤایەتی:

ه- لایەنێکی تری گشتگیری ئەم بیروباوەڕە بریتییە لەوەی کە هەموو نەتەوەکانی گرۆی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، هەروەکوو چۆن خودی مرۆڤ بەتەواوی دەگرێتەوە بە عەقڵ و ڕووح و دڵەوە، بۆیە ئیسلام ئایینی تاکە نەتەوەیەك نییە، نە ئایینی تاکە چینێکیشە، نە بەتەنهاش ئایینی سەرکردە و دەسەڵاتدارانە کە بێدەسەڵاتەکان وەلانێن، نە بەتەنهاش ئایینی بێدەسەڵاتەکانە کە دەسەڵاتدار و سەرکردەکان وەلانێن، بەڵکوو بەیامێکە هەموو نەوەی ئادەم دەگرێتە خۆی لە هەموو ڕەگەز و نەتەوەکان.

### بیروباوەڕێکە دابەشبوون و لەت لەتبوون قبوڵ ناکات:

و- یەکێکی تر لە شمولی و گشتگیری ئەو بیروباوەڕە ئەوەیە کە لەت لەتبوون قبوڵناکات، کە بێگومان دەبێت هەموو ناوەڕۆکەکەی وەربگیرێت بەبێ ڕەتکردنەوەی هیچ بەشێکی، هەتا ئەگەر کەسێك باوەڕ بە ٩٩٪ی ناوەڕۆکی ئەو عەقیدەیە بهێنێت و ١ ٪ی ڕەتبکاتەوە و باوەڕی پێنەهێنێت ئەوە بە موسڵمان هەژمارناکرێت و حیسابی موسڵمانی بۆ ناکرێت. ئیسلام ئەوەمان لێ دەخوازێت کە مرۆڤ تەواوی کاروبار و ڕێشمەی خۆی بداتە خودای گەورە و باوەڕ بە هەموو ئەو شتانە بهێنێت کە لەو ئایینەدا هاتوون.

**شموولی و گشتگیری لەباوەڕهێنان بە هەموو ئەوەی کە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) دابەزێندراوە:**

ز- بیروباوەڕی ئیسلامی تایبەت نییە بە باوەڕبوون بە غەیب و پەنهانەکان بە تەنها، وەکو باوەڕبوون بە خودا و ڕۆژی دوایی و فریشتەکان، بەڵکوو هەموو بنچینەیەکی سابت و چەسپاو و هەواڵێکی ڕاست کە بەدروستی لە پێغەمبەرەوە (درووودی خودای لەسەر بێت.) هاتبێت و هەرچی لە ئاییندا بە پێویست داندرابێت و زاندرابێت لە خۆدەگرێت، هەرکەسێك شتێك لەوانە ئینکاری بکات و ملی بۆ نەدات ئەوە موسڵمان نییە.

کەواتە بیروباوەڕی ئیسلامی کۆی بنچینە و پایە و هەواڵ و حوکمە سابت و بڕیار لەسەردراوەکان لە قورئان و سوننەتدا لەخۆدەگرێت، ئا ئەوە پێویستی و داخوازی باوەڕە.

چەند نموونەیەك لەمبارەوە:

١- باوەڕبوون بە هەموو پەرتووکێکی دابەزێندراو و پێغەمبەرێکی نێردراو

٢- باوەڕبوون بە فەرز و پێویستیەکانی ئیسلام

٣- باوەڕبوون بە دانانی حەڵاڵ بە حەڵاڵ و حەرام بە حەرام

## جیاوازی ئایینی و سیاسی و فکری

ڕەوایی جیاوازی و هەبوونی لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی و موسڵمانادا شتێکی حاشا هەڵنەگرە، بە دڵناییەوە هەبوونیان ڕەوایە و نابێ ڕێگرییان لێبکرێت چونکە:

**١.** خوا و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) مۆڵەتیانداوە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت: (فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ).[١] واتە: (جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافر و بێباوەڕ بێت). کەواتە خودای گەورە ڕێیداوە و سەرپشکی کردوون، هەروەها پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێت.) ڕێیداون و لەگەڵیاندا ژیاوە و پەیمان و بەڵێنیشی لەگەڵدا بەستوون.

**٢.** ئەگەر ڕێگا بە جیاوازیی ئایینی و فکری نەدرێت، هیچ واتایەک بۆ تاقیکردنەوەی خوایی نامێنێت و ئەوکات خەڵکێکی دووڕوو و مونافیق پەیدا دەبێت، کە دیارە دووڕوو زۆر مەترسیدارترە و نابێت هەرگیز ببینە هۆکارێک بۆ سەرهەڵدانی ئەم جۆرە کەسانە، بەڵکوو ئازادیان بکەین.

---

(١) [الكهف: ٢٩].

**٣.** زۆرلێکردن لە ئاییندا بەهیچ شێوەیەک دروست نییە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموویت: (فَمَن شَاءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاءَ فَلْيَكْفُرْ)[١]. واتە: (جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافر و بێباوەڕ بێت). هەروەها دەفەرموویت: (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ).[٢] واتە: (بەهیچ جۆرێک زۆرکردن نییە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا). دینداری بەزۆر نابێت بکرێت و دین بە زۆر نادرێت بەسەر کەسدا.

**٤.** لەبەرانبەر ئازادی و جیاوازی قبووڵکردندا ستەم و زۆرداری و زۆرەملێ هەیە، کە دیارە ئەمەش دووبارە دوورە لە ڕووحی ئیسلام.

**٥.** ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت.) و هاوەڵان و مێژوو و کۆمەڵگەی پێغەمبەر و کۆمەڵگەی موسڵمانان، ئەوا فرەیی و ئازادی و جیاوازی ئایینی و فکری دەبینین و ئەم جیاوازیانە هەرگیز ڕێیان لێ نەگیراوە.

**٦.** ئەگەر بڕوانینە خودی گەردوونیش کە دروستکراوی خودایە، دووبارە جیاوازی و فرەیی دەبینین و لە هەموو شوێنێکی ئەم گەردوونەدا بەرجەستە بووە، کەواتە ڕێگریکردن لە فرەیی و جیاوازی ڕاوەستانە لە دژی فیترەتی خۆت و بوون و گەردوون.

---

(١) [الكهف: ٢٩].

(٢) [البقرة: ٢٥٦].

کەواتە بە کوردی و بە کورتی هەموو کەسێک مافی هاوڵاتیبوونی هەیە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی و موسڵماناندا. نابێ جیاوازی بکرێ لە نێوان هیچ کەسێکدا و هەمووی دەبێ ئەرک و مافی خۆی پێبدرت و هەمووی مافی هاوڵاتیبوون و مافی بەژداری سیاسی و ئابووری و زانستی و فکری و ئایینی و.... پێدەدرێت و پێوەر و بنەما دەبێت لێهاتوویی و دەستپاکی و ڕاستگۆیی و... بێت.

## هۆکارەکانی نەبوونی ڕاجیایی عەقیدەیی و فیقهی عەقیدەیی لە سەرەتای ئیسلامدا

لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دا، بارودۆخی فکری و عەقیدەیی زۆر جیاواز بوو، چونکە ئەم هۆکارانەی پاڵنەربوون بۆ پەیدابوونی ڕاجیایی عەقیدەیی و فیقهی عەقیدەیی بوونیان نەبوو، وە خودی پێغەمبەر (ﷺ) لەناویاندا بوو و هەر شتێ هەبا بە زووترین کات وەڵامی دەدانەوە و هەموانیش پێی ڕازی دەبوون و دڵ و عەقڵیان لەسەری گرێ دەدا! هەر بۆیە لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دا، جیاوازی و ڕاجیایی زۆر کەمبوو، وە ئەوەندەی سەرقاڵ بوون بە عەمەل و کار و کردەوە و دەعوە و بانگەواز ئەوەندە نەدەپڕژانە سەر گفتوگۆی بێ بەرهەم و نەزۆک، ئەوان کۆمەڵگەیەکی دامەزراو و عەمەلی بوون، وە کاریگەرییان بە وەحی و پێغەمبەر (ﷺ) بوو، نەک بە فیکرە بیانی و دەرەکییەکان، هەر بۆیە بارودۆخی عەقیدە لەم کاتەدا باردۆخێکی ئارام و بێ گرێ و گۆڵ بوو، بارودۆخێکی فکری عەمەلی قورئانی پێغەمبەرانە بوو.

## هۆکارەکانی پەیدابوونی ڕاجیایی و جیاوازی عەقیدەیی و کەلامی و فکری و فەلسەفی

لە سەرەتاکانی سەدەی دووەمی کۆچیەوە تا دەهات گرفت و کێشە فیکری و عەقیدەییەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لە برەو و گەشەکردندا بوون. شەڕی ناوخۆی موسوڵمانان هەر لە سەردەمی ئیمام عەلی و موعاویەوە تا شەهیدبوونی ئیمام حوسەین و دواتر، ڕاپەڕینە بەردەوامەکانی خەواریج، شیعەکان، زوبەیریەکان و عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەشعەس دژی ئومەویەکان، چەندین پرس و کێشەی فیکرییان بەدوای خۆیاندا هێنا، لەوانە، پرسەکانی: ئیمان، کافربوون، جەبریەت، سەرپشکایەتیی، ئەنجامدانی تاوانی گەورە و کاریگەریی لەسەر ئیمان، مەرجی پێشەوایەتیی، ڕاپەڕین دژی خەلیفە و چەندینی تر.

هەروەها لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام بە زۆربەی ناوچەکاندا، موسڵمانبوونی زۆرێك لە نەتەوە خاوەن کەلتور و ئاینە جیاوازەکان، چەندین پرسیاری جۆربەجۆری فەلسەفی و ئاینی کەوتە بەرباس و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە مەسەلەکانی: زیندووبوونەوە، ئاڵوگۆڕی گیان، یەکگرتن(الاتحاد) تێکەڵبوون (الحلول) گەڕانەوەی مردوو بۆ دنیا، دوالیزم، سیانەیی... تاد.

هەر لە هەمان باسدا و بەهۆی لەدەستدانی شکۆ و دەسەڵاتیان، هەندێك لە هەوادار و لایەنگرانی پاشماوەی ئایینە هیندی و ئێرانیەکان کاریان دەکرد لەسەر بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی ئیباحیەت

و بێدینی و گومان لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی و دادی خوایی و زەرورەتی پێغەمبەرایەتی و راستێتی رۆژی دوایی.

لەلایەکی ترەوە لەناوچەکانی بەسرە و کوفە و هەندێك ناوچەی شام دیاردەی هەڵبەستنی فەرمووده بەدەم پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێت) لە دەرکەوتن و گەشەکردندا بوو، لەم سەروبەند و بارودۆخە ئاڵۆز و پڕ کێشەیەدا، گروپە کەلامییەکانی وەك موعتەزیلە و ئەشعەری و ماتوریدی سەریانهەڵدا.

کەواتە دەتوانین هۆکارەکان بەم شێوەیە کورت بکەینەوە:

**١.** قورئان، خودی قورئان خۆی هۆکارێکە بۆ ڕاجیایی، چونکە هەم قیرائەتەکان هەم تێگەیشتن لە ئایەتەکان هەم خودی زمانی عەرەبی کە پێی دابەزیوە هەم مەنهەجی هەڵێنجانی ئەحکام و تێگەیشتنەکان لە ئایەتەکان هۆکارێکن بۆ ڕاجیایی.

**٢.** سوننە، حەدیس، فەرمووده، سوونـنە هۆکارێکە بۆ ڕاجیایی، هەم لە ڕووی جێگیربوونیەوە، هەمیش لەڕووی مانا و ڕاڤەکانی، هەمیش لەڕووی گەیشتن بە زانایان و نەگەیشتن پێیان، هەمیش لە ڕووی کارکردن بە هەندێ حەدیس لەلای هەندێ کەس و کارپێنەکردنی لەلای هەندێکی تریان.

**٣.** هۆکاری سیاسی، بۆنموونە کێشەی ئیمامەت و سەرۆك و کێشەی خەواریج و ئیمامی عەلی و موعاویە، یان سەرەتای سەرهەڵدانی شیعە، کە پێیان وابوو ئیمامی علی لە هەموو کەس شایەنترە بۆ

خەلیفایەتی، یان گروپەکانی تر کە زۆربەیان دوورنەبوون لەو هۆکارە، هەربۆیە دواتر دەوڵەتیان هەبووە، وەك موعتەزیلەکان.

**٤.** زمان، چونکە وشە و دەستەواژەکان مانای جیاواز جیاوازیان هەیە کە لە کۆتاییدا سەردەکێشت بۆ ڕاجیایی. بۆنموونە ڕێبازی تەشبیە و تەنزیە (وێچوێنەرەکانی خودا بە دروستکراوەکانی) (پاك ڕاگرەکان) بەهۆی جیاوازی لە دەستەواژەی ئایەتەکانی ناو و سیفەتەکانی خودا پەیدا بووە، یان ڕێبازی قەدەرییەکان و جەبرییەکان بەهۆی جیاوازییان لە دەقەکانی قەدەر و قەزا پەیدابووە، یان جیاوازی گروپە کەلامییەکان و تێڕوانینیان بۆ ئیمان بەهۆی جیاوازییان بووە لە تێڕوانینی زمانەوانی بۆ ئیمان.

**٥.** شوێن و باردۆخ و ژینگە و کات و سەردەم.

**٦.** بەرژەوەندی هەندێ کەس و زانا.

**٧.** وەرگێڕانی کتێبە فەلسەفیەکان. کە کتێبە فەلسەفیەکان وەرگێڕدران لەلایەن خودی موسڵمانانەوە، هەبوو پێی کاریگەر بوو، هەبوو دژی بوو و ڕەدی دەدایەوە، هەشبوو ڕاڤە و شەرحی دەکرد، هەشبوو دەیویست هەماهەنگی دروست بکات لەنێوان ئایین و فەلسەفەدا

**٨.** هاتنە ناوەوەی غەیرە موسڵمانان بۆ ناو ئیسلام و موسڵمانان. کە ئەم جۆرانە دەهاتنە ناو ئیسلامەوە پاشخانێکی تری فکرییان هەبوو، ئیدی بەم هۆیەوە زانستی کەلامیش هاتە مەیدان بۆ وەڵامدەنەوەیان.

**٩.** خودی عەقڵ خۆی، چونکە عەقڵیش لە خودی خویدا هۆکارێکە چونکە عەقڵەکانیش جیاوازن.

دەربارەی پاڵنەرەکان توێژەرانی زانستی کەلام بوونە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** هۆکار و پاڵنەری دەرەکی بوونی نییە، ئەوەی هەیە ناوخۆییە.

**دووەم:** هۆکار و پاڵنەری دەرەکی بوونی هەیە، وەك نەسرانیەت و یەهودیەت و غەنوسیەت و فەلسەفەی یۆنانی.

(د. عەلی سامی نەششار) زانای کەلام و توێژەر لەم بابەتەدا پێی وایە بەهیچ جۆرێك پاڵنەری دەرەکی بوونی نییە و ئەوەی هەیە بریتییە لە پاڵنەری ناوخۆیی، ئەویش دوو شتە: سیاسی و زمان، واتە زمانی دەق، چونکە کە ڕاجیایی لە زمانی دەقدا دروستبوو، ڕاستەوخۆ ڕەنگدانەوەی دەبێت بەسەر تێڕوانینیەکاندا، لەگەڵ سیاسەت.

بۆ کاریگەری فەلسەفەی یۆنانیش پێی وا نییە زانستی کەلام و زاناکانی پێی کاریگەر بن، یازدە قوتابخانە ئەسڵییەکەی فەلسەفەی یۆنانی باس دەکات، پاشان ئەوە ڕەت دەکاتەوە کە کەلام و زاناکانی پێی کاریگەر بووبن، بەڵکو وەڵامیان داونەوە، بۆیە ئەو زانستی کەلام بە فەلسەفەی ئیسلامی ناوزەند دەکات، زاناکانیشی بە (فەیلەسوفە موسڵمانەکان)، فەیلەسوفانی تری وەك ئیبن سینا و فارابی و... بە (فەیلەسوفە ئیسلامییەکان)

ناوزەند دەکات، چونکە پێی وایە ئەوانە فەلسەفەی یۆنانییان هێناوە و پاشان بەرگێکی ئیسلامییان کردۆتەبەر، ئەمە ڕای د. عەلی سامی نەششارە، پەرتووکە بەناوبانگەکەشی ناوناوە (گەشەکردنی هزری فەلسەفی لە ئیسلامدا) (نشأة الفكر الفلسفى فى الإسلام).

## ئازادی بیرو باوەڕ لە قورئاندا

قورئان پڕییەتی لە ئازادی و ڕێپێدانی بۆنموونە:

١. (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ) (البقرة: ٢٥٦). بە هیچ جۆرێک زۆر لێ کردن لە دیندا نی یە (بۆ هاتنە ناو ئیسلام).

٢. (وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ). یونس: ٩٩. ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە بڕوای دەهێنا ئەو (خەڵکەی) وا لە زەوی دا هەموو تێکڕا دەی ئایا تۆ (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) زۆر لە خەڵکی دەکەیت هەتا ببنە بڕوادار.

٣. (قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ) (هود: ٢٨) نووح وتی: ئەی گەلەکەم هەواڵم بدەنێ ئەگەر من بەڵگەی ئاشکرام هەبێت لەلای پەروەردگارمەوە و ڕەحمەتێکی پێ بەخشیبم لەلایەن خۆیەوە بەڵام ئەوە لە ئێوە شاردرابێتەوە ئایا بە زۆر پابەندتان بکەین پێیەوە لە کاتێکدا ئێوە حەزی لێ ناکەن.

٤. (وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ) (الکهف: ٢٩)بڵێ حەق (ئەم قورئانە) لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕبێنێ و هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت.

٥. ﴿فَٱعْبُدُواْ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ﴾ (الزمر: ١٥).

٦. ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ﴾ (الغاشية: ٢١) ﴿لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾ (الغاشية: ٢٢).

٧. ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾. (النحل: ١٠٦).

٨. ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ (يونس: ١٠٤).

٩. ﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدْعُ وَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَقُلْ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ (الشورى: ١٥).

١٠. ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ فَٱعْفُواْ وَٱصْفَحُواْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ١٠٩).

١١. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ (التوبة: ٧٣).

١٢. ﴿يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ﴾ (التوبة: ٧٤).

١٣. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ﴾ (محمد: ٢٥).

١٤. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ (النساء: ١٧٠).

١٥. ﴿قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَنۡ أَبۡصَرَ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ عَمِيَ فَعَلَيۡهَاۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ﴾ (الأنعام: ١٠٤).

١٦. ﴿وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ﴾ (النمل: ٩٢).

١٧. ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٍ﴾ (الزمر: ٤١).

١٨. ﴿مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا﴾ (الإسراء: ١٥).

١٩. (مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ) (الروم: ٤٤).

٢٠. (هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا) (فاطر: ٣٩).

٢١. (إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ) (الزمر: ٤١).

٢٢. (خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ) (الأعراف:١٩٩).

٢٣. (نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ) (ق: ٤٥).

٢٤. إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ) (الحج: ١٧).

٢٥. (أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ) (فاطر: ٨).

٢٦. (أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَٰذِبٌ كَفَّارٌ) (الزمر: ٣).

٣٧. (فَإِنْ ءَامَنُواْ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ) (البقرة: ١٣٧).

٢٨. (وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ) (هود: ١١٨).

٢٩. (ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ) (النحل: ١٢٥).

٣٠. (قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ) (يونس: ١٠٨).

٣١. (وَلَوْ أَنَّ قُرْءَانًا سُيِّرَتْ بِهِ ٱلْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ ٱلْأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ ٱلْمَوْتَىٰ بَل لِّلَّهِ ٱلْأَمْرُ جَمِيعًا أَفَلَمْ يَاْيْـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوْ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمْ حَتَّىٰ يَأْتِيَ وَعْدُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ (الرعد: ٣١).

٣٢. وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ) (هود:١٢١).

٣٣. (أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ) (فاطر: ٨).

٣٤. ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ (الممتحنة: ٨).

لەگەڵ چەندان بەڵگە و ئایەتی دیکە....

کەواتە لە هەموو ئایەتەکاندا چەند شتێك وەردەگیرێت:

١. هەموو کەسێك ئازادی بیروباوەڕی هەیە، وەك لە ئایەتەکاندا ئاماژەی بۆ کرا: کێ باوەڕدێنێت با باوەڕبێنێت، کێش بێباوەڕدەبێت با بێباوەڕبێت.

٢. تۆبزی و زۆر لە کەس ناکرێت بۆ ئیمان و باوەڕهێنان و پابەندبوون بە ئایینەوە.

٣. هەر سزایەك هەبێت بۆ بێباوەڕان لە قیامەتدایە نەك لە دونیا، بۆیە ئەگەر لە ئایەتەکان وردبینەوە سزای دونیایی بۆ دانەناون و لە هەموویاندا دەفەرموێت: لە قیامەتدا سزا دەدرێن.

٤. ئاشتی ئەسڵە و هەتا هێرش نەکرێت هێرش نابرێت، هەتا شەڕ نەخوازرێت شەڕ ناکرێت، هەتا ئاشتی هەڵبژێرن پێکەوە ژیانیان لەگەڵدا دەکرێت.

## تێکگیرانی عەقڵ و نەقڵ

پرسی تێکگیرانی عەقڵ و نەقڵ پرسێکی یەکجار هەستیار و گرینگە لە فکر و فەلسەفە و ئوسولی فیقهی ئیسلامیدا، لەم بارەیەشەوە چەندان ئاڕاستە و تەوژم پەیدابوون:

١. نەقڵ پێش عەقڵ دەخرێت، بەڕەهایی.

٢. عەقڵ پێش نەقڵ دەخرێت، بەڕەهایی.

٣. قەتعی پێش دەخرێت، جا عەقڵ بێت یان نەقڵ، واتە حوکمی ڕەهایی نادات بەهیچیان، بەڵکو لەوە دەکۆڵێتەوە کامە لایە قەتعییە و کامە زەنییە، چونکە مەرج نییە هەموو کاتێ نەقڵەکە قەتعی بێت، زۆرجار زەنییە، بەهەمان شێوە عەقڵیش زۆرجار بڕیارەکەی زەنییە و قەتعی نییە، جا هەرگیز ناکرێ نەقڵێکی قەتعی دژی شتێکی عەقڵی قەتعی بێت، ئیللا لەکاتی تێکگیراندا یەکێکیان زەنییە و ئەوی دیکەیان قەتعی.

کەواتە بەکورتی ئەوەی زۆربەی زانایان لەسەری کۆکن، ئەوەیە کە: هەرگیز عەقڵی سەلیم و ساغ تێکناگیرێت لەگەڵ نەقڵی سەحیح و ڕاست، هەرکاتێ تێکگیران ڕوویدا لەنێوانیاندا، ئەوە دەبێ بگەڕێین، چونکە ئیللا کێشە لە یەکێکیاندا هەیە، یان نەقڵەکە سەحیح و ڕاست نییە، یان عەقڵەکە سەلیم و ساغ نییە و تێگەیشتنەکەی ناڕاست و ناتەواوە.

کەواتە دەتوانین بڵێین عەقڵ و نەقڵ دوو دۆڵی لێک جودا نیین، بەڵکو هەردووکیان سەرچاوەکەیان خودایە، وەحی و عەقڵ هەردووکیان سەرچاوەکەیان خودایە، بۆیە ناکرێ تێکبگیرێن، نەقڵ بەبێ عەقڵ نابێ و عەڵیش بەبێ نەقڵ نابێ، ئەگەر عەقڵ چاو بێت، نەقڵیش ڕووناکییە، واتە نە چاو بەبێ ڕووناکی دەبینێت، نە ڕووناکیش بەبێ چاو دەبینرێت، وەک ئەنیشتاینیش دەڵێت: زانست بەبێ ئایین شەلە و ئایینیش بەبێ زانست کوێرە. کەواتە هەردووکیان تەواوکاری یەکترین و هیچ دژی یەکتری نیین، وەک وتراوە: (العَقْلُ قائدٌ والدِّينُ مَدَدٌ) واتە: عەقڵ ڕابەرە و ئایینیش هاریکار، چونکە ئەگەر عەقڵ نەبایە ئایینیش نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێ و بمێنێتەوە.

ئەو تێڕوانینەش زۆر هەڵەیە، کە بەردەوام بەربەستێکی دروستکردووە لەنێوانیاندا، چونکە عەقڵ و نەقڵ لە تێڕوانینی باوەڕداردا دووشتن، هەرگیز لێک دانابڕێن و بە دابڕاندنیان لە یەکتری مرۆڤ تووشی گرفتی گەورە دەکات و لە زۆر شوێندا وەڵامەکان یان نادرێنەوە، یان بەهەڵە دەدرێنەوە.

زاراوەی عەقڵانی و نەقڵانیش لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی کە باسمانکرد، زۆر هەڵەیە، چونکە ئەگەر عەقڵانی بی و نەقڵانی نەبی، ئەوە زۆر نا عەقڵانی و نانەقڵانی، ئەگەریش نەقڵانی بی و عەقڵانی نەبی، هەم دووبارە زۆر ناعەقڵانی و نانەقڵانی.

ئەم بابەتی دژیەکی عەقڵ و نەقڵە سەرەتا لەلای مەسیحی و جولەکەکانەوە دەستی پێکرد، چونکە ئینجیل و تەورات

هەردووکیان دەستکاری زۆریان کراوە، تاگەیشتووە بەوەی ژمارەی ئینجیلەکان بگات بە ٧٠ ئینجیل، هەرکەسێ دەهات بە ئارەزووی خۆی شتی لێ زیاد و کەم دەکرد و چۆنی ویستبا ئاوا دەیگۆڕی، وە لەلایەن کڵێساوە زۆرجار دژایەتی زۆری عەقڵ و زانست و زاناکان و فەیلەسوفان کراوە، بەڵام لە ئیسلامدا ئەم جۆرە کێشانەمان نیین، وەحی دەستکاری نەکراوە و پڕیەتی لە پشتگیری و هاندانی عەقڵ و عەقڵکاری و زەمکردنی بەکارنەهێنانی عەقڵ.

راغیبی ئەصفەهانی لە کتێبی (الذریعة إلی مکارم الشریعة) دا دەفەرموێت: خوای گەورە دوو نوێنەری خۆی ناردووە بۆ لای مرۆڤ، یەکەمیان: شاراوەیە و لەناو خۆیدایە کە بریتییە لە (عەقڵ)، دووەمیان: بەدەرەوەیە و دیارە کە بریتییە لە پێغەمبەر، مرۆڤ ڕێگەیەکی دیکە شک نابات پێی بگاتە ئەو نوێنەرە دیارە کە هەیە تا سوودی لێوەربگرێت لە ڕێگەی نوێنەرە شاراوەکەوە نەبێت کە عەقڵە، نوێنەرە شاراوەکە دەرک بەوە دەکات کە نوێنەرە ئاشکراکە ڕاست دەکات، ئەگەر عەقڵ نەبوایە پێغەمبەر بەتەنها نەدەبووە بەڵگە لەسەر خەڵکی!

ئیمامی غەزالیش کە زۆرجار بە دژە فەلسەفە ناوزەند دەکرێت (لە ڕاستیدا ئەو دژی هەندێ بۆچۆنی هەڵەی فەیلەسوفان بووە نەک خوودی فەلسەفە) لە چەند شوێنێک و لە چەند پەرتووکێکیدا زۆر بەجوانی باسی عەقڵ دەکات، بۆنموونە لە پێشەکی کتێبی (المستصفی) دا دەفەرموێت: (عەقڵ وەک دادوەر

وایە، کە هەرگیز ناکرێ لەسەر کار لابرێت و شتێک بخرێتە جێی، شەرعیش وەک شایەتحاڵێکی متمانەدار و دادپەروەر وایە کە عەقڵ ئەکات بە کەشتی دینداری و هەڵگری سپاردەکانی خودا).

لەکوتاییدا ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێبکرێت ئەوەیە کە عەقڵ لەگەڵ ئەو هەموو گرینگی و گەورەییەی، بەڵام ناکرێ بکرێتە سەنتەر و سەرچاوەی سەرەکی و حاکم و بڕیاردەری ڕەها، چونکە عەقڵەکانیش لە کەسێکە و بۆ کەسێکی دیکە و لە شوێنێک و سەردەمێک بۆ شوێن و سەردەمێکی دیکە دەگۆڕێت، بۆنموونە عەقڵی فەیلەسوفەکان لەگەڵ عەقڵی پزیشکەکان، یان عەقڵی عەوام لەگەڵ عەقڵی زانایان، یان عەقڵی کەسێکی مارکسی لەگەڵ کەسێکی لیبراڵ، یان کۆمەڵناسێک و ئابووری ناسێک، لەیەک جیاوازە، یان سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ، کە هەرسیکیان مامۆستا و قوتابی یەکتر بوون، بەڵام لە زۆر شتدا جیاوازبوون، کەواتە ئێمە عەقڵێکی ڕەهای جێگیری نەگۆڕی کۆدەنگی لەسەرمان نییە (غەیری چەند یاسەیەکی گشتی عەقڵی، کە پێویستە هەموو مرۆڤێکی عاقڵ بڕوای پێیان بێت، وەک یاسای: دوو شتی دژ بەیەک لە یەک کات و شوێن و کەسدا کونابنەوە، یان...)، کەواتە ناکرێ ئێمە عەقڵی چەند کەسێک یان بەرژەوەندی دەستە و تاقمێک بکەینە دادوەر و هەموو شتەکان بکەینە قوربانی، بەتایبەتی لە دونیای ماددیگەرایی و سەرمایەداریدا هیچ بنەمایەکی عەقڵی ئەخلاقی بوونی نامێنێت

غەیری مادده و بەرژەوەندی و شەهوەت و ئارەزوو....، کەواتە دەبێ بەهاوسەنگییەوە سەیری ئەم بابەتە بکرێت و نە عەقڵ بەڕەهایی نە نەقڵ بەڕەهایی، بەڵکو وەک دوانەیەکی دەستەملان سەیربکرێن و مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، لە ژێر عەقڵی ساغ و نەقڵی ڕاست و واقیع و زانست و سەردەم و بارودۆخدا.




## ئاڕاستە و تەوژم و ڕێباز و قوتابخانەکان لە مێژووی موسڵمانان‌دا

لە مێژووی موسڵمانان‌دا ئاڕاستە و ڕێباز و گرووپ و فکری جیاواز جیاواز پەیدابوون، کە ئەمانیش دابەش دەبن بۆ چەند ئاڕاستەیەک:

١. ئاڕاستەی گرووپە سیاسییەکان

٢. ئاڕاستەی گرووپە کەلامییەکان

٣. ئاڕاستەی گرووپە فیقهییەکان

٤. ئاڕاستەی گرووپە فەلسەفییەکان

٤. ئاڕاستەی گرووپە سۆفی و عیرفانییەکان

٥. ئاڕاستەی گرووپە مۆدێرن و نوێکان

ئێمە لێرەدا زۆر زۆر بەکورتی ئاماژە بەم ئاڕاستانە دەکەین تەنها وەک خستنە ڕوویەک بەبێ چوونە ناو پێناسە و مێژوو و...، تەنها وەک سەرەقەڵەمێک دەربارەی ئەم ئاڕاستە جیاوازانە چەند دێڕێکیان لەبارەوە دەدوێین، ئەگەرنا هەر دانەیەکیان پەرتووکێک و چەندان پەرتووک و توێژینەوەیان پێویستە.

## ١. ئیمـام گــەراکان

ئیمام گەراکان بریتیبوون لە شیعەکان، شیعەکان جۆریان زۆر زۆرە! بەڵام ئێمە ناچینە ناو تەفاسیلەکەیان، شیعەکان زۆر زێدەڕۆییان کردبوو لە پیرۆزکردن و گرنگیدان بە ئیمام و ئیمامەت، هەر لە ئیمامی عەلییەوە بیگرە تاوەکوو دەگاتە ئیمامی مەهدی، بەشێویەک زێدەڕۆییان کردبوو لای هەندێکیان وەک پێغەمبەرە! لای هەندێکی تریان تا خوداش دەڕوات و لەگەڵ خودا تێکەڵ دەبێت و دوایی دەبێتە خودی خودا! کەواتە ئیمام گەراکان و شیعەکان بەشێوەیەکی گشتی هەموو کار و گرنگیدانێکییان کورت کردبۆوە لە ئیمام و ئیمامەت و کردبوویانە ئەسڵی مەزهەب و ئایین، بەشێوەیەک زێدەڕۆییان کردبوو هەندێکیان ئیمام و ئیمامەتیان وەک ئەسڵێکی ئایین سەیر دەکرد و بڕوانەبوون پێی بە کوفر هەژمار دەکرا!

## ٢. کردەوەگەراکان، تەکفیرگەراکان

کردەوەگەراکان یان تەکفیرگەراکان و تەکفیرییەکان لە کۆندا بەشێوەیەکی گشتی بریتیبوون لە خەواریجەکان، خەواریجەکان کاروکردەوەیان بە ڕوکنی ئەساسی ئایین دادەنا. هەربۆیە هەرکەسێک گوناهێکی گەورەی کردبا، ڕاستەوخۆ تەکفیریان دەکرد! لای ئەوان، عوسمان و عەلی و تەڵحە و زوبێز و عائیشە و موعاوییە و....، هەموویان کافر بوون! ئەوانە کاروکردەوەیان

کردبووە ئەسڵی ئایین! تەکفیریان کردبووە ئەسڵ و بنەمای ئایین! نەک هەر ئەوە ئەوەی ئەوانەشی پێ کافر نەبێت کە لای ئەمان کافرە ئەمیش کافرە و دەرچووە لە ئایین!

### ٣. باوەڕگەراکان

باوەڕگەراکان ئەوانە بوون کە خودی باوەڕیان کردبوو بە ئەسڵی ئایین، واتە هەرکەسێک باوەڕی هەبوو، ئیدی تەواو ئەم کەسە باوەڕدارێکی تەواوە! هەرچی بیکات لە خراپەکاری و هەرچیش نەیکات لە چاکەکاری کاریگەری نییە! چونکە باوەڕی هەیە و باوەڕیش ئەسڵی ئایینە، ئەمانە کە مورجیئەکانن، یان جەهەمییەکان، کاروکردەوە لای ئەمان ئەرزشێکی نییە و باوەڕ و ئیعتیقاد ئەسڵی هەموو شتێکە و کار و کردەوە پەیوەندییێکی بە ئیمان و باوەڕەوە نییە.

### ٤. عەقڵگەراکان

عەقڵگەراکان بریتبوون لە قەدەرییەکان و بەشێکی موعتەزیلە و بەشێکی فەیلەسوفەکان، ئەمانە عەقڵیان کردبوو بە سەنتەر و لە لوتکە دایان نابوو، وەحی بووبوو بە شتێکی لاوەکی و عەقڵ بووبوو بە ئەسڵ و سەرچاوەی یەکەم! عەقڵ سنووری خۆی نەدەزانی و بانگەشەی سەربەخۆبوونی دەکرد!

### ٥. فەلسەفەگەراکان

فەلسەفەگەراکان ئەوانە بوون فەلسەفەیان کردبوو بە ئەسڵ و وەحییان کردبوو بە شتێکی لاوەکی! ئەوەندە زێدەڕۆییان کردبوو لە پیرۆزکردنی فەلسەفە هەتا گەیشتبووە ئەوەی بڵێن فەیلەسوفەکانی یۆنانیش پێغەمبەر بوونە و فەلسەفەش لە وەحی زیاتر بێت کەمتر نییە! ئەوەندە زێدەڕۆییان کردبوو لە پیرۆزکردنی فەلسەفە تاوەکوو گەیشتبوو بەوەی بڵێن: وەحی بە تەرازووی فەلسەفە دەبێت بپێورێت! واتە دەبێت هەرچۆنێک بێت فەلسەفە بکەینە تەرازوو و هەموو ڕوکنەکانی ئایینی پێ بپێوین!

### ٦. ناخ و ڕووح گەراکان

ناخ و ڕووح گەراکان ئەوانە بوون ناخ و ڕووحیان لێ بوو بوو بە ئەسڵی ئایین و هیچ ئەرزشێکیان بۆ شتەکانی تر دانەدەنا! حاڵ گەیشتبوو بەوەی ناخ و ڕووح ببنە پێوەر و سەچاوەی سەرەکی مەعریفە، واتە مەعریفەشیان لە ڕووحەوە وەردەگرت، ئەم ئاڕاستەیە زۆر لە عیرفان و تەسەوف و ڕووحانییەت ڕۆچووبوو، ناخ و ڕووح بوو بوو بە سەنتەر لای ئەوان! لای زۆرێکیان عەقڵ و کردەوە ئەرزشی نەمابوو، هەموو گرنگیەکان چڕکرابوونەوە لە ڕووح و ناخدا.

## ٧. جەبرگەراکان

جەبرگەراکان ئەوانە بوون پێیان وابوو مرۆڤ مەخلوقێکی تەواو تەواو مەجبوور و زۆرلێکرا و قورمیشکراوە، پێیان وابوو مرۆڤ تەنها ڕۆڵی جێبەجێکردن دەگێڕێت و هیچ ویست و ئیرادەیەکی نییە! پێیان وابوو ئیرادە و ویست و توانا تەنها و تەنها هی خودایە و بەس! شتێک نییە بە ناوی ویست و ئازادی و ئیرادەی مرۆڤ!

## ٨. دەقگەراکان

دەق گەراکان بە پێچەوانەی عەقڵانییەکان هەموو شتێکیان لە دەقدا کورت کردبۆوە! زاهیری دەق بوو بوو بە سەنتەر! لادان لە زاهیری دەق یەکسان بوو بە لادان لە ئایین! زاهیری دەق پیرۆز بوو، عەقڵ ڕۆڵێکی نەمابوو، تەئویل و تەفسیر و....، بەلادان لە دەق و لە ئایین پێناسە دەکرا!

## ٩. ڕەوتی مودێرنەی ڕۆژئاوایی

مۆدێرنەخوازەکان زێدڕۆییان بەشێوەیەک کردبوو لە عەقڵدا تاوەکوو ئاستی بەخوداکردن، واتە (تألیە الانسان) لای ئەمان عەقڵ و مرۆڤ خودان و هیچ شتێک لە سەرووی عەقڵ و مرۆڤەوە بوونی نییە! کەواتە عەقڵ کۆتایی هەموو شتێکە! مرۆڤ چەق و لوتکەیە و نابێ شتێک لە سەرووی ئەمانەوە هەبێت! ئەمانە لەخۆیانەوە وەهمی دژیەکی عەقڵ و نەقڵیان

ڕاگەیاند! بانگەشەی بێبنەمای تێکگیرانی ئایین و عەقڵییان دەکرد! هەربۆیە هەموو بابەتەکانی وەک موعجیزە و شتە غەیبی و پەنهانەکان لای ئەمان ڕەتکراوە و باوەڕپێنەکراوە!

## ١٠. ڕەوتی پۆست مۆدێرنە

پۆست مدێرنەش درێژکراوەی مۆدێرنەیە بەڵام زۆر بە خەستر و خراپتر، مۆدێرنە مرۆڤی دەکردە خودا! بەڵام پۆست مۆدێرنە مرۆڤ دەکات بە شت (تشييئ الانسان)! واتە مرۆڤیش وەک هەموو شتەکانی تر شتێکە و هیچی تر! هەربۆیە هیچ بنەمایەکی عەقڵی و ڕەوشتی و ئایینی و هەتا عەقڵیش لای ئەمان بوونی نییە! واتە دەبن بە پووچگەراییەکی تەواو تەواو و ئەوپەڕی بوونی مرۆڤ وەک شتێک لە شتەکان دەبینن! کەواتە هیچ ئامانجێک لە بوون و نەبووندا نییە! هیچ شتێکی ڕەها بوونی نییە! هیچ شتێک بە ناوی حەقیقەت و حەق بوونی نییە و هەمووی هیچە!

## ١١. ڕەوتی میانڕە و مامناوەند

ئەم ڕەوتە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێت.) هاتووە و بەدرێژایی مێژووش ڕێبەر و هەواداری خۆی هەبووە، ئەم ڕەوتە ڕەوتێکی میانڕەوە، ناوەڕاستی شتەکانی گرتووە، هاوسەنگی لەنیوان وەحی و عەقڵ و ڕووح و جەستە و زانست و واقیع و مەقاسیددا ڕاگرتووە و زێدەڕەویی و کەمڕەوی لە هیچیاندا ناکات.

**کەواتە ئەگەر بڕوانین هەموویان بەدێراژایی مێژوو لە ئیفراط و تەفریط دا ژیاون!**

**باشترین مەنهەج مەنهەجی قورئانە، باشترین مەنهەج مەنهەجی کۆتاییە، باشترین مەنهەج مەنهەجی میانڕەوی و وەسەتیەتە.**

## قوتابخانە ئیسلامییە عەقیدەیی و فكرییەكان

قوتابخانە بریتییە لە تەوژمێک کە خاوەن مەنهەج و میتۆدێکی دیاریکراو و تایبەت بەخۆیەتی کە جیای دەکاتەوە لە غەیری خۆی لەبارەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستێک لە زانستەکان.

جیاوازی هەیە لە نێوان قوتابخانەی عەقیدەیی و تەوژوم و گروپی عەقیدەیی، چونکە گروپی عەقیدەیی واتە: کۆمەڵێک کە بیروبۆچونێک یان چەند بیروبۆچونێک یان وتەیەک کۆی کردونەوە، بەڵام مەرج نییە وەک قوتابخانە میتۆد و مەنهەجێکی دیاریکراوی هەبێت، بۆنموونە ئەگەر بەوردی سەیری بکەین و زاراوەکان لەشوێنی خۆیان بەکار بێنین نابێ دەستەواژەی قوتابخانە دەربېڕدرێت بەسەر خەواریج و قەدەری و مورجیئە، چونکە ئەمان میتۆد و مەنهەجێکی دیاریکراویان نەبووە بۆ بابەت و پرسەکانی عەقیدە، بەڵکو بیروبۆچون و ڕایان هەبووە لەم بارەیەوە، بۆ نموونە خەواریج هەندێ ڕایان هەبووە دەربارەی حوکم و تاوانبار و... قەدەرییە سەرەتاییەکانیش ڕایان هەبووە دەربارەی زانستی ئەزەلی خودا و ئینکارییان لێی کردووە، مورجیئەکانیش ڕایان دەربڕیوە دەربارەی ئیمان و پێکهاتەکەی.

هەرچەندە ئەوەش خۆی ڕاجیایی تێدایە کە ئەمانە قوتابخانە بوون یان نا، بەڵام ئەگەر قوتابخانەشیان بۆ بەکاربێنین، دەتوانین وەک حوکمی زۆرینە بۆیان دەربېڕین.

گروپی کەلامی دوو جۆرە

**١. هیچ بنەمایەکی گشتی نییە بۆی بگەڕێتەوە.**

**٢. بنەمای گشتی هەیە و بۆی دەگەڕێتەوە و دەقە شەرعییەکانی پێ دەپێوێت.**

کەواتە دەکرێ هەندێ لە گروپەکانیش بە قوتابخانە دابنرێن، بەڵام هەموویان نا، بەتایبەت قوتابخانە کۆنە سەرەتاییەکان، وەک قەدەرییە سەرەتاییەکان و مورجیئەکان.

کەواتە دەتوانین بڵێین: هەموو قوتابخانەیەک گروپە، بەڵام هەموو گروپێک قوتابخانە نییە.

قوتابخانە فراوانە و زۆربەی زانستەکان قوتابخانەیان هەیە، بۆ نموونە لە فقیهدا قوتابخانەی ئەهلی ڕەئی و ئەهلی حەدیس هەیە، لە ئوسوڵی فیقە قوتابخانەی موتەکەللیمەکان و فوقەها هەیە، لە نەحو قوتابخانەی بەسڕییەکان و کوفییەکان هەیە.

ئینجا ڕاجیایی ئەم قوتابخانانە یان دەگەڕێتەوە بۆ بنەما گشتی و ئوسوڵییەکان، یان دەگەڕێتەوە بۆ بنەما لاوەکی و فەرعییەکان، وە قوتابخانەکانیش لەسەر ئەم بنەمایە یان زۆر لێک نزیکن یان زۆر لێک دوورن، یان لەو نێوەندەدان.

## قوتابخانە عەقیدەیی و فکرییەکان

ڕاجیایی هەیە لە دابەشکاری قوتابخانە عەقیدەییەکاندا، بۆنموونە ئیمامی غەزالی دابەشیان دەکات بۆ چوار قوتابخانە: موتەکەللیمەکان، باطینییەکان، فەیلەسوفان، سۆفییەکان.

بەڵام ئێمە لێرەدا دابەشکارییەکی تری بۆ دەکەین:

١. قوتابخانەی کەلامی.

٢. قوتابخانەی فەلسەفی.

٣. قوتابخانەی کەشفی و سۆفیگەری.

٤. قوتابخانەی سەلەفی.

### یەکەم: قوتابخانەی کەلامی

لەپێشەوە باسی هۆکاری ناونانی زانستی کەلام بەم ناوەمان کرد و بیروبۆچونەکانمان باس کردن.

قوتابخانەی کەلامی لە کۆن و نوێدا دوو میتۆد و جۆر بووە، لەگەڵ ئەوەی لەکۆتاییدا هەر یەک شتن، بەڵام ئەم جیاوازیەشیان هەیە:

١. میتۆدێکی تێکەڵ بە فەلسەفەی یۆنانی و لۆژیکی ئەرستۆیی و جەدەل و گفتوگۆی فەلسەفی و ڕۆچوون لە عەقڵانیەت و ڕەددانەوەی تەوژمەکانی بەرامبەر.

**٢.** میتۆدێکی عەقڵی بەڵام خۆپارێز لە ڕۆچوون لە فەلسەفە و لۆژیکی یۆنانی.

کەواتە قوتابخانەی کەلامی یەک جۆر و شێواز نییە.

بەڵام بەگشتی دەتوانین بڵێین قوتابخانەی کەلامی: قوتابخانەیەکی عەقیدەیی فکری عەقڵییە، بۆ چەسپاندن و وەڵامدانەوەی پرسە عەقیدەییەکان پشت بە عەقڵ و نەقڵ دەبەستێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی تێکنەگیرانی ئەو دوانە دەدات و عەقڵ دەکاتە حەکەم و عەقڵکاری لە زۆربەی پرسە عەقیدەیی و کەلامییەکاندا دەکات.

کەواتە قوتابخانەی کەلامیش قوتابخانەیەکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پرسە عەقیدەییەکاندا بە میتۆد و مەنهەجێکی عەقڵی.

زەقترین میتۆد و بنەمای کەلامی بریتییە لە: پشت بەستن بە نەقڵ و عەقڵ بۆ پرسە عەقیدەییەکان، بەڵام لەکۆتاییدا دەبێ دەق و نەقڵیش بخرێتە ژێر ئەو بنەما عەقڵییانەی کە دایان ناوە و نابێ زاهیری دەق وەربگیردرێ و ڕاستەوخۆ تەسلیمی هەموو دەقێک ببی بەبێ گەڕانەوە بۆ بنەما عەقڵییەکان.

ئەوەی شایەنی باسە زانایانی ئیسلام زۆربەی زۆریان سەر بەم قوتابخانەیە بوون، چونکە نوێنەری سەرەکی و زەقی ئەم قوتابخانەیە ئەشعەری و ماتوریدییەکانن، زانایانیش زۆربەی زۆربەریان لە زانای فیقە و تەفسیر و حەدیس و زمانەوانی و ئوسوڵ و.... سەر بەم دوو قوتابخانەیە بوون.

لە گرینگترین قوتابخانە کەلامییەکان: قەدەری، موعتەزیلە، ئەشعەری، ماتوریدی،...، هەر یەکێکیش لەم قوتابخانە و گروپانە چەندان تاقم و پێڕی تریان هەیە... هەر یەکێکیشیان بنەمای فکری تایبەت بەخۆیانیان هەیە، هەیانە زۆر لێك نزیکن، وەك: ئەشعەری و ماتوردییەکان، هەشیانە زۆر لێك دوورن وەك قەدەرییەکان و ئەشعەرییەکان، هەمووشیان مێژوو و سەرهەڵدان و بنەما و.... خۆیانیان هەیە، لەبەر درێژبوونەوەی کتێبەکە ناتوانین باسیان بکەین، بەڵام کتێبی زۆر هەیە، هەم بە کوردی هەم بە عەرەبی، هەر کەسێ ویستی لێیان شارەزا بێت با بگەڕێتەوە بۆیان.

### تایبەتمەندی و بنەماکانی قوتابخانەی کەلامی

١. تاوتووێکردن و چەسپاندنی بیروباوەڕی ئیسلامی بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی.

٢. تەئویل، تەئویلی ئەو دەقانەی مانای ڕوون و عەقڵی نادەن بەدەستەوە، یان گومان و پرسیار دەخەنە سەر دین و خودا و وەحی، بەشێوەیەك تێکگیران نەبێت لەنێوان عەقڵ و نەقڵدا.

٣. وەڵامدانەوەی بەرامبەرەکان بە مەنهەج و میتۆدی عەقڵی و کەلامی و فکریی و فەلسەفی، واتە بەکارهێنانی میتۆدی عەقڵی و فکری.

٤. ڕۆچوونی هەندێکیان لە عەقڵکاری و فەلسەفاندن بۆ چەسپاندنی و عەقیدە و وەڵامدانەوەی گومان و پرسیارەکان.



## دووەم: قوتابخانەی فەلسەفی

ئەم قوتابخانەیە ناوی خۆی بەخۆیەوەیە، چونکە فەلسەفییە و پشت بە فەلسەفە دەبەستێت بۆ پرسە ئایینی و عەقیدەییەکان.

فەیلەسوفان وەک کیندی (٢٥١ ک) و فاڕابی (٣٣٨ ک) و ئیبن سینا (٤٢٨ ک) و ئیبن ڕوشد (٥٩٥ ک) و...، ئەمانە ناودارانی فەیلەسوفە موسڵمانەکان بوون و خاوەنی ئەم قوتابخانەیەن.

بنەمای بیرکردنەوە لای ئەم قوتابخانەیە و فەیلەسوفەکانی دەربارەی عەقیدە و بیروباوەڕ بریتییە لە فەلسەفە و فەیلەسوفانی یۆنانی و غەیرە یۆنانی، بەتایبەتتریش ئەڕستۆ، زۆربەیان دەگەڕانەوە بۆ ئەڕستۆ و فەلسەفەی مەششائی (الفلسفة المشائية) بۆیە پێی وتراوە مەششائی چونکە ئەڕستۆ عادەتی وابوو بە ڕۆیشتنەوە وانەی دەوتەوە و قوتابییەکانی لەدەوری کۆدەبوونەوە.

قوتابخانەی فەلسەفیش دابەش دەبێت بۆ دوو ئاڕاستە

١. فەلسەفەیان کردۆتەوە بنەمای هەموو شتێک و شەریعەت و ئایینیان وەک بنەما سەیرنەکردووە، هەتا گەیشتووە بەوەی هەندێکیان ئەوەندە سەرسام بن بە ئەڕستۆ بڵێن پێغەمبەر بووە یان کەمتر نەبووە، کەواتە ئەم ئاڕاستەیە زێدەڕۆیی زۆری کردووە لە پێگەی فەلسەفە و عەقڵدا و هەموو شتێک بە پێوانەی فەلسەفە دەپێوێت.

**٢.** هەوڵیانداوە هەماهەنگی دروستبکەن لەنێوان ئیسلام و فەلسەفەدا بەتایبەت فەلسفەی یۆنانی، واتە بەحیسابی خۆیان نەهاتوون وەحی پێشتگوێ بخەن و وەلای نێن و ڕەتی بکەنەوە، بەڵکو هەوڵی گونجانیان داوە و بۆ پرسە ئایین و عەقیدەییەکان بنەمای فەلسەفی و ڕای فەلسەفی و فەیلەسوفیان هێناوە و هەوڵی ئەوەیان داوە بەزۆریش بێت پرسە ئایینییەکان ببەنەوە بۆ بنەما فەلسەفی و فەیلەسوفەکان بەتایبەت یۆنانییەکان.

کەواتە ئاڕاستەی یەکەمیان زۆر زیاتر ڕۆچوون لە فەلسەفە و فەلسەفاندنی پرسە ئایینییەکان و فەلسەفە و فەیلەسوفانیان کردووە بە پێوەر بۆ وەرگرتنی وەحی و نەقڵ و دەق.

## بنەما و تایبەتمەندی قوتابخانەی فەلسەفی

**١.** ڕۆچوون لە عەقڵکاری و فەلسەفە و فەلسەفاندندا.

**٢.** هەماهەنگی دروستکردن لە نێوان فەلسەفە و ئاییندا و گونجاندنیان ئەگەر بەزۆریش بێت.

**٣.** فەلسەفە کردنە حەکەم بۆ یەکلاکردنەوەی پرسەکان.

**٤.** زێدەڕۆیی کردن لە پێگەی فەیلەسوفان، بەتایبەت فەیلەسوفانی یۆنانی.

**٥.** ڕۆچوون لە هەندێ بابەتی ناکردەیی ناپێویستی فەلسەفی.

٦. هێنانە ناوەوەی هەندێ پرسی فەلسەفی یۆنانی بۆ ناو عەقیدە و فکری ئیسلامی و ڕاپێچکردنی عەقیدە و فکری ئیسلامی بۆ ژێر ئەم پرسانە.

٧. دوورکەوتنەوە لە قورئان و وەحی و ڕووحی قورئان (بەڕەهایی نا).

٨. کەم گرینگیدان بە لایەنی ڕووحی.

٩. تێکەڵکردنی عیرفان و تەسەوفی ئیسلامی بە فەلسەفەی یۆنانی و ونکردنی ڕووحانییەتە ئیسلامییەکە تێیدا. ئەمە لای فەیلسوفە عیرفانییەکان.

## سێیەم: قوتابخانەی کەشفی و عیرفانی و تەسەوفی

ئەم قوتابخانەیە قوتابخانەیەکی ئاڵۆز و سەختە و ئەمیش دوو ئاڕاستەی هەیە:

### ١. ئاڕاستەی کەشفی ئیلهامی سۆفی عیرفانی

ئەم ئاڕاستەیە پێی وایە پێغەمبەر (ﷺ) حەقی ڕوونکردۆتەوە و گەیاندوویەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ هاوتا بێت لەگەڵ ئەوەی ڕووح و دەروون پێی دەگات، ئەگەر دژ بوەستێتەوە لەگەڵ کەشف ئەوە دەبێ یان تەئویل بکرێ یان بسپێردرێ بەخودا، ڕێگای بەدەستهێنانی کەشفیش بریتییە لە جیهادی نەفس و دڵ دەروون و پاککردنەوە و پاڵفتەکردنی.

کەشف واتە: واتا و مانا و مەعریفە کە بەبێ بیرکردنەوە و تێڕامان بەدەست دێت، لەڕێگەی تەزکیەی نەفس و دڵ و دەروون، کە بەچەندان ڕێگە بەدەست دێت.

تایبەتمەندی ئەم ئاڕاستەیەش خۆی لە زۆر ڕۆچوون لە عیرفان و تەسەوفدا دەبینێتەوە، هاوکات لەگەڵ زێدەڕۆیی کردن لە لایەنی ڕووحی و کەم گرینیگدان بە لایەنی عەقڵی و فکری و زێدەڕۆییکردن لە بەگەورە سەیرکردنی شەخس و کەساتییە ئایینییەکان (بەڕەهایی نا و هەمووشیان وا نیین)، هەروەها هەوڵدان بۆ چەسپاندنی لایەنە فکرییەکان بە بنەمای ڕووحی.

### ٢. ئاڕاستەی ئیشڕاقی فەلسەفی:

ئەم ئاڕاستەیە پشت بە کەشف دەبەستێت بەڵام بەلایەنی فەلسەفی و ڕوونکردنەوەی دەروون لە لایەنی ماددی، نەک لەڕێی خۆبرسی کردن و...

کەواتە ئەم ئاڕاستەیە تێکەڵەیەکە لە کەشف و ڕۆحانیەت لەگەڵ عەقڵ و فەلسەفە، واتە تێکەڵکردنی کەشف و عیرفان بە فەلسەفە.

فاڕابی و ئیبن سینا و ئیبن طوفەیل و سوهرەوەردی (٥٨٧ ک) ئەم ئاڕاستەیان تەبەننی کردووە، بەتایبەت سوهرەوەردی کە بەردی بناغەی دانا و چەسپاندی.

بەڵگە و پشت پێبەستراو لای ئەم ئاڕاستەیە بریتییە لە کەشف و فەیزی نورانی کە هەڵدەڕژێتە ناو دەرونییانەوە لەڕێی دەروون و فەلسەفەوە، وەحی و دەق سەرچاوەی یەکەم نیین، بەڵکو دەبێ وەحی و دەقەکانیش بەم کەشف و فەیزە نورانییە فەلسەفیانە بپێورێن.

تایبەتمەندی ئەم ئاڕاستەیەش خۆی لە زۆر ڕۆچوون لە فەلسەفە و تەئویلی دوور دەبینێتەوە، هاوکات لەگەڵ ڕۆچوون لە عیرفان و تەسەوفێکی پشتئەستوور بە کەشف و فەیز و هەڵڕژانی ڕووحی، لەگەڵ قورسی و تەعقیدات لە داڕشتن و نووسین و دەربڕیندا.

## چوارەم: قوتابخانەی سەلەفیەت

سەلەفیەت لە (سلف، یسلف، سلفا) ەوە هاتووە، لەڕووی زمانەوانییەوە واتە: تێپەڕی و بەسەرچوو.

سەلەف واتە: پێشینان و باو و باپیران، خزمانی پێشین. یان هەموو شتێک دەگرێتەوە کە ڕۆیشتووە و تێپەڕیوە لەو سەردەم و واقیعە نەماوە کە مرۆڤ تێیدا دەژییێت.

(سَلَف) لەڕووی زاراوەوە واتە: هاوەڵان و شوێنکەوتوان و شوێنکەوتووی شوێنکەوتووان.

بەڵام ئەگەر وەک قوتابخانەیەکی فکری عەقیدەیی وەریبگرین دەتوانین ئاوا پێناسەی بکەین:

قوتابخانەیەکی فکری عەقیدەیی فیقهی دەقگەرایە، بۆ تەفسیری ئیسلام دەگەڕێتەوە بۆ قورئان و سوننە بە تێگەیشتنی سەلەف و پێشینان.

سەلەفیەت لە خودی خۆیدا یەک تەوژم و یەک ڕەوت و یەک شێواز و یەک مەنهەج و میتۆد و یەک جۆر نییە، بەڵکو جۆراو جۆرن و بەپێی کەس و شوێن و کات و سەردەم و ژینگەش گۆڕاون و دەگۆڕێن....

## مێژووی سەلەفیەت

سەلەفیەت وەک مەنهەج و میتۆد دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ئیسلام و سەردەمی هاوەڵان، چونکە هەر لەسەردەمی هاوەڵانەوە ئەو جۆرە لەبیرکردنەوە هەبووە کە بەتەواوی بگەڕێیەوە بۆ دەق و بەدوای فەلسەفە و حیکمەتی ئەحکامەکاندا نەچی، واتە بێ چەندوچوون بگەڕێوە بۆ دەق و تەئویل مەکە و زاهیری دەق وەرگرە.

بەڵام دوایی لەدوای هاوەڵانیش قوتابخانەی یارانی فەرموودە (اهل الحدیث) پەیدابوون، کە ئەمانیش دووبارە ئەم میتۆدەیان هەبوو، کە بگەڕێیەوە بۆ دەق و خۆت دووربگری لە تەئویل و زاهیری دەق یان نزیک لە زاهیر وەربگری.

دیارترین کەسایەتی بەهێز ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو، کە لەو سەردەمەدا زۆر بە بەهێزی و ڕاوەستاوی بەرگری کرد

لەم تەوژمە و تا دوا هەناسە بڕوای پێی بوو و بڵاوی کردەوە و قوربانیشی بۆ دا.....

دوایی لەسەدەی حەوت شەیخی ئیسلام ئیمام ئیبنو تەیمییە کە لە ٧٢٨ کۆچی دوایی کرد توانی بەهێزترین بەرگری لەم تەوژم و قوتابخانەیە بکات! ئیبنو تەیمییە کەسایەتییەکە وێنەی کەم بووە لە مێژووی ئیسلام و موسڵماناندا، لەگەڵ تێبینی لەسەری بەڵام بەتەنها توانی لەڕووی هەموو تەوژمە فکری و کەلامی و عەقیدەیی و فەلسەفیەکانی سەردەمی خۆیی و پێش خۆشی بوەستێتەوە و وەڵامی هەموان بداتەوە و نووسین لەسەر هەموان بنووسێت و بیروڕاو بنەما فکرییەکانی خۆیشی وەک ڕەگ دابوکتێت و دەیان پەرتووکیان لەسەر بنوسێت و وەک شاخ پتەو و لەسەر پێ وەستاو و بەهێز بوەستێت و قوربانی بۆ بیروڕاو بۆچونەکانی و فکرەکانی بدات و بۆ ساتێکیش تەنازول و سازشیان لەسەر نەکات! تا لەکۆتاییدا لە زینداندا کۆچی دوایی کرد!

دوای ئەم ئیمام ئیبنو قەییم جەوزی هات کە قوتابی ئیبنو تەیمییە بوو، ئەویش زۆر بە لێبڕاوانە بەرگری لەم ڕێباز و قوتابخانەیە کرد، تا دوا هەناسە تێیکۆشا لەپێناویدا، تا لە ٧٥١ کۆچیدا ماڵئاوایی کرد.

دوای ئەمانیش دیاترین کەسایەتی کە هات و وەک فریادڕەس ئەم قوتابخانەیەی جارێکی تر دوای دابڕان و لاوازبوون و غائیب

بوون هێنا ناو گۆڕەپان و جیهانی ئیسلامی و هەتا ڕۆژئاواش شێخ موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب بوو، ئەویش لە ساڵی ١٢٠٦ ک ماڵئاوایی کرد.

دوای ئەمانیش دەیان و سەدان زانایان پەیدابوو، بەتایبەت بە هۆی پاڵپشتییە بەردەوام و زۆرەکانی وڵاتانی کەنداو بەگشتی و سعودییە بەتایبەتی.

لە ئێستاشدا دەیان ڕەوتی جیاجیان هەیە، خاوەن دەیان قوتابخانە و ئاڕاستەی جیاوازن.

سەلەفیەت یەک جۆر نییە، سەلەفیەت لە خودی خۆیدا یەک تەوژم و یەک ڕەوت و یەک شێواز و یەک مەنهەج و میتۆد و یەک جۆر نییە، بەڵکو جۆراو جۆرن و بەپێی کەس و شوێن و کات و سەردەم و ژینگەش گۆڕاون و دەگۆڕێن...

## بنەما و تایبەتمەندییە گشتییەکانی سەلەفیەت

سەلەفیەت وەک هەر قوتابخانە و تەوژم و ڕێبازێکی تر بنەمای خۆی هەیە بۆ تێگەیشتن لە ئایین، بەڵام دەکرێ بڵێین ئەو بنەمایانە بەپێی کەس و لایەن و ئاڕاستە و شوێن و کات ڕەهای تەواوەتی نیین، بەڵام لەیەکەوە زۆر نزیکن:

١. سەرچاوەی ئایین و عەقیدە و بیروباوەڕ و فکر بریتییە لە قورئان و سوننە بە تێگەیشتنی سەلەف، واتە هاوەڵان و شوێنکەوتووی هاوەڵان و شوێنکەوتووی شوێنکەوتووان.

**٢.** بەکارهێنانی عەقڵ بۆ تێگەیشتن لە ئایین ئاساییە بەڵام بە سنورداری و بە ئەندازەی ئەوەی کە ببێتە خزمەتکاری نەقڵ، واتە عەقڵ دانپێدانەر و پشتگیری کەری نەقڵە، کەواتە بۆی نییە نەقڵ ڕەتبکاتەوە و بە هەبوونی نەقڵ خۆی بێنێتە مەیدان، یان لە زاهیری دەق لابدات و تەئویل یان تەحریف بکات. هەربۆیە سەلەفیەت دژی ڕێبازی عەقڵانیەت و کەلام و فەلسەفەیە، یان بڵێین زانایانی کەلام و فەلسەفە و موعتەزیلەکان، وە هاوڕانین لەگەڵ ئەشعەرییەکان و ماتوردییەکان و باقی قوتابخانەکانی تر، چونکە پێیان وایە ئەمانە هەموویان زێدەڕۆییان کردووە لە پێگەی عەقڵ و بەکارهێنانی.

**٣.** دووربوون لە تەئویل و بەکارنەهێانی، سەلەفیەت بەگشتی پێی وایە، تەئویل دوورکەوتنەوەیە لە زاهیر و دەق و مانا و مەبەستی حەقیقی خودای گەورە و پێغەمبەر (ﷺ)، پێی وایە دەق نابێ بەرەو تەئویل ببرێ و دووربکەوێتەوە لە زاهیر، هەربۆیە تەئویل کەران لە ڕێباز و قوتابخانەکانی تر بە موبتەدیع و زەندیق و زۆرجار کافر و دژە دینیش ناودەبەن.

**٤.** سەلەفیەت بەگشتی دژی مەجازە، چونکە پێی وایە لەژێر ناوی مەجازدا حەقیقەت دەشاردرێتەوە.

**٥.** داهێنان لە دیندا (بدعة) بەهیچ جۆرێک دروست نییە، ئایین هەمووی براوەتەوە و کۆتایی هاتووە، وە هەموو جۆرە داهێنانێک لە ئاییندا دروست نییە و هەمووی خراپە.

**٦. ئیجتیهاد داشنەخرابێ نزیکە لەوەی دابخرێت، چونکە ئەوان پێیان وایە ئەوەی هەیە خوای گەورە و پێغەمبەر (د.خ) و زانایانی سەلەف هەموویان بڕاندۆتەوە، ئیدی ئیجتیهاد لەپای چی؟!**

**٧. نوێگەری لە ئاییندا ناکرێت و تەجدید و نوێگەری تەحریفە.**

**٨. خیلاف و جیاوازی و ڕاجیایی قبوڵکراو نییە لە عەقیدە و بیروباوەڕدا.**

**٩. پێویستە لە عەقیدەدا پەیوەست بی بەو لەفز و وشە و دەستەواژانەی کە لە قورئان و سوننەدا هاتوون، وە دوور بکەویەوە لە هەر وشە و دەستەواژەیەکی عەقیدەیی و کەلامی و فەلسەفی کە لە قورئان وسوننەدا نەهاتبێت.**

## بنەما عەقیدەیی و کەلامی و فکرییەکانی جەماوەری موسڵمانان

١- باوەڕهێنان بە خودای گەورە

٢- باوەڕهێنان بە فریشتەکان

٣- باوەڕهێنان بە پەڕتووکەکانی خودای گەورە

٤- باوەڕهێنان بە پێغەمبەران

٥- باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی

٦- باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر (خێر و شەڕی)

١- پوختەی باوەڕهێنان بە خودا بریتییە لە:

أ. باوەڕی تەواو بەوەی کە خوای گەورە حەقە و بوونی هەیە.

ب. هەروەها تاك و تەنها و بێهاوەڵە.

ج. وەسفکراوە بە هەموو تەواوییەك (صفات کمال)، پاك و بێگەردە لە هەموو کەم و کوڕییەك.

د. تەنها و تەنها ئەو شایەنی ئەوەیە بپەرسترێت و گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری بکرێت.

٢- پوختەی باوەڕهێنان بەفریشتەکان بریتییە لە: باوەڕی تەواو بە هەبوونیان، باوەڕ بێنین کە لە ڕووناکی و نوور دروستکراون،

هەرگیز سەرپێچی و بێفەرمانی خودا ناکەن لە شتێك کە فەرمانیان پێ کرابێت، چیان پێ بگوترێت دەیکەن.

٣- پوختەی باوەڕهێنان بە پەرتووکەکانی خودا بریتییە لە: باوەڕبوونی تەواو بەوەی کە خوای گەورە چەندین پەرتووکی ناردووە بۆ پێغەمبەران کەهیدایەتی بەندەکان و چاکەی دونیا و قیامەتیانی تێدایە، وە ئەو پەرتووکانە وەحی خوای گەورەن و حەق و ڕاستن لەلایەن خوای گەورەوە هاتوون.

٤- پوختەی باوەڕهێنان بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة و السلام) بریتییە لە: باوەڕی تەواو بەوەی کە خوای گەورە بۆ هەر ئوممەت و میللەتێك پێغەمبەرێکی لە خۆیان ناردووە کە بانگیان دەکات بۆ خودا بەیەکگرتن و بە تەنها پەرستنی، ڕێنموونیان دەکەن بۆ هەموو چاکەیەك بۆ دونیا و قیامەتیان، هەروەها لە هەموو زیانێکی دونیا و قیامەتیان ئاگاداریان دەکەنەوە.

٥- پوختەی باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی بریتییە لە: باوەڕبوونی تەواو بە ڕاستی و دروستی هەموو ئەو هەواڵانەی کە خوای گەورە و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) ڕایانگەیاندووە لەبارەی هەموو ئەو ڕووداوانەی کە لەدوای مردنەوە ڕوودەدەن، لەناویاندا پرسیاری ناوگۆڕ و ئەوەی بە دوای دادێت لە زیندووکردنەوە و حەشر و حیساب و وەرگرتنەوەی پەرتووک و تەرازو و پردی سیرات و بەهەشت و دۆزەخ.

**٦. پوختەی باوەڕهێنان بە قەزا و قەدەر بریتییە لە: باوەڕبوونی تەواو بەوەی کە هەرچی ڕوودەدات لە خێر و زیان لە ژێر ویست و دەسەڵاتی خوای گەورەدایە.**

## بنەمای ئایینی و بنەمای مەزهەبی

ئایین شتێکە و مەزهەب شتێکی تر، ئایین خواییە و مەزهەب ڕا و تێگەیشتنی مرۆڤەکانە بۆ ئایین.

**بنەمای ئایینی:** بریتین لەو بنەما و پڕەنسیپانەی کە ئەسڵ و بنەمای ئایینن و لادان لێیان بە لادان لە ئایین هەژمار دەکرێت.

بنەمای مەزهەبی: بریتین لەو بنەما و پڕەنسیپانەی کە ئەسڵ و بنەمای ئایین نیین، بەڵکو ئەسڵ و بنەمای مەزهبین، وە لادانیش لێیان بە لادان لە ئایین هەژمار ناکرێت، بەڵکو بە لادان لە مەزهەب هەژمار دەکرێت.

کەواتە لادان لە بنەمای ئایین لادانە لە خودی ئایین و چونە دەرەوەیە لە بازنەکەی.

لادانیش لە بنەمای مەزهەبی لادانە لە مەزهەب و چونە دەرەوەیە لە بازنەی ئەم مەزهەبە.

بۆنموونە باوەڕبوون بە خودا و پێغەمبەرایەتی و پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی بنەمای ئایینین، ئەگەر کەسێک باوەڕی پێیان نەبێت لە بازنەی ئایین و ئیسلام دەچێتەوە دەرەوە و بە ئیماندار و موسڵمان هەژمار ناکرێت.

بەڵام باوەڕبوون بە پلەیەک لەنێوان دووپلەدا (المنزلة بين المنزلتين) ی موعتەزیلەکان و (ئیمامەت) ی شیعەکان، بنەمای مەزهەبین، واتە ئەگەر موعتەزیلییەک باوەڕی بە پلەیەک لەنێوان دووپلەدا (المنزلة بين المنزلتين) نەبێت لە بازنەی ئیعتیزال دەچێتەدەر و بە موعتەزیلە هەژمار ناکرێت لای موعتەزیلەکان، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە بەس لە مەزهەب چۆتە دەر نەک لە ئایین، واتە لای ئەوان موعتەزیلە نییە، بەڵام ئیماندار و موسڵمانە و لە بازنەی ئیسلام و ئیمان نەچۆتەدەر، تەنها لە بازنەی ئیعتیزال چۆتە دەر.

وە بۆنموونە (ئیمامەت) لای هەندێ لە شیعەی دوازدە ئیمامی بنەمای مەزهەبییە ـلای هەندێکی تریان بنەمای ئایینییە ـ، کەواتە بەم پێیە ئەگەر کەسێک باوەڕی بە ئیمامەت نەبێت ئەوە لە بازنەی شیعەی دوازدە ئیمامی چۆتەدەر و بە شیعە هەژمار ناکرێت، بەڵام بە موسڵمان و ئیماندار هەژمار دەکرێت چونکە لە بنەمای ئایینی دەرنەچووە[١].

---

(١) العقيدة الإسلامية ومذاهبها، د. عبد الرحمن قحطان الدوري.

## بنەمای لادانە عەقیدەیی و کەلامی و فکرییەکان

١. باوەڕنەبوونی درووست بەخودا و ماهیەت و حەقیقەتی.

٢. باوەڕنەبوونی تەواو بە وەحی و پەیامی خوایی.

٣. باوەڕنەبوونی تەواو بە کامڵی و تەواوی شەریعەت و ئایین.

٤. باوەڕنەبوون بە کۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی.

٥. ڕاڤەی نادروست بۆ زیندوبونەوە و ڕووح.

٦. تەحریف و لادان لە مەبەستە سەرەکییەکانی ئایین.

٧. تەحریف و لادان لە ڕووحی قورئان.

٨. تەکفیر.

٩. خۆبینینەوە لە بازنەی حەق و خەڵک بینین لە بازنەی ناحەق.

١٠. تەقلید و چاولێکەری و تەمبەڵی مەعریفی و گەڕان بە دوای ڕاستی ڕێباز و قوتابخانەکان.

١١. لادانی ئەخلاقی و نەهێشتنی سنوری بەهاکان.

١٢. عەقڵگەرایی زێدەڕۆیانە.

١٣. بێ ویست کردن و بێ ئەرزش کردنی مرۆڤ.

**١٤.** بەخوا کردنی مرۆڤ.

**١٥.** دەقگەرایی و زاهیری بوون.

ئەوەی کە باسمان کردن پوختەی بنەماکانی لادانە کەلامی و عەقیدەیی و فکرییەکان بوون، کە تەوژم و ڕێبازە کەلامی و عەقیدەیی و فکری و فەلسەفییەکانی ناو مێژووی موسڵمانان تێی کەوتبوون، بەڵام بەڕێژەی جیاجیا، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی پێی دەوترێ سوونني ڕەسەن (بە مانا فراوانەکەی، نەك بەمانا تەسك و تەنگەکە و کورتهەڵێنانی لە تەوژم و ڕێبازێکی دیاریکراو) لادانەکەیان لە بازنەی جوزئیاتدایە و نەپەڕیوەتەوە بۆ بازنەی کولیات و قەتعیات و بنەما نەگۆڕەکان.

## هەڵوێستی دروست بەرامبەر تەوژوم و قوتابخانە کەلامی و عەقیدەیی و فکرییەکان

سەرەتا دەبێ بیانکەینە دوو جۆر:

**جۆری یەکەم:** نییەتیان پاکە و بەهەڵەداچوون.

**جۆری دووەم:** هەڵەن و خەڵکیش بەهەڵە دەبەن و مەبەستیشیان بەلاڕێدابردن و سەرلێشێواندنی خەڵکە.

جۆری دووەم نابێ بێنینە ناو مامەڵەی جۆری یەکەمەوە

**١.** هەمووان بە تێگەیشتن بە ڕاڤە و تەفسیر و هەوڵ و.... بۆ ئایین تێبگەین نەک وەک خودی ئایین.

**٢.** دەبێ بیروڕاکان لێک جیا بکەینەوە، بزانین ئەو ئیجتهادەی کە کردوویانە لە ئوسوڵدایە یان لە فروع، لە قەتعیاتدایە یان لە ظەنیات، ئەگەر لە ظەنیاتدا بوو ئەوە دەبێ بە سینگێکی فراوانەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، مەرج نییە هاوڕایان بین، بەڵام ئەگەر ئیجتیهادەکەیان لە قەتعیاتدا بوو ئەوە دەبێ هەڵوێستە بکەین و نابێ تەسلیم بین، بۆ نموونە بڵێن خودا نەزانە، یان هەموو شتێ نازانێت، یان بڵێن مرۆڤ دەگاتە ئاستی خودا یان تێیدا دەتوێتەوە، یان قورئان دەستکاری کراوە، یان پێغەمبەرایەتی بەردەوامە، یان.....، لەم جۆرانە نابێ سازش بکرێت و دەبێ ڕاست بکرێنەوە.

**٣.** هەتا بکرێ گومانی باشیان پێ ببەین.

٤. ڕا و بۆچون و بنەماکانیان وەک خۆی ڕاڤە بکەین و لێیان تێبگەین و بەلاڕێیاندا نەبەین.

٥. بۆ ڕاوبۆچونەکانیان بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکانی خۆیان.

٦. جیاوازی بکەین لە نێوانیاندا، چونکە هەر قوتابخانەیەک بەدەیان و جاری وا هەیە بە سەدان ئاڕاستەی تێدایە، کەواتە ناکرێ قسەیەک کە کراوە پاڵی بدەیە لای هەموویان.

٧. هۆکار و پاڵنەرەکانی پشت ڕاوبۆچونەکانیا بخوێنینەوە، چونکە هەموو شتێک پاڵنەر و هۆکاری خۆی هەیە.

٨. هەتا دڵنیا نەبین لەوەی کە ئەم شتەیان کردووە یان گوتووە نەیاندەینە پاڵ.

٩. وەک مرۆڤ سەریریان بکەین.

١٠. لەسەردەم و کات و شوێن و ژینگە و بارودۆخی خۆیاندا خوێندنەوەیان بۆ بکەین.

١١. هەوڵی لێک نزیک بوونەوەیان بدەین.

١٢. نەوروژاندنی خیلاف و جیاوازی نێوانیان لەناو خەڵکی سادە و غەیرە تایبەتمەند بەم بابەتانەوە.

١٣. بەدین نەکردنی بیروڕای قوتابخانەکان، چونکە لە کۆتاییدا هەمووی ڕاوبۆچونی مرۆڤە.

١٤. دروستکردنی گفتوگۆ و دیالۆگ لە نێوانیاندا.

١٥. مامەڵە نەکردنی بەرژەوەندی خوازانە لەگەڵیاندا.

١٦. نەبوونی دەمارگیری بۆ لایەک و قوتابخانەیەک.

## جیاكاری نێوان (مذهب، منهج، عقیدة)

(مذهب) ڕێباز (منهج) میتۆد (عقیدة) بیروباوەڕ، لێك جیاوازن و یەك شت نیین، كە بەداخەوە زۆرجار تێكەڵ بەیەكتری دەكرێن و حوكم لەسەر ئەم تێكەڵییە بنیات دەنرێت!

قوتابخانە كەلامی و عەقیدەییەكان (مذهب) ڕێباز (منهج) میتۆدیان لەیەك جیاوازە، بەڵام بەشێوەیەكی گشتی عەقیدەیان یەك شتە، چونكە عەقیدە تەنها بیروباوەڕە نەگۆڕە قەتعییەكان دەگرێتەوە، نەك گۆڕاو و جوزئییەكان، واتە ئەوانەی قبوڵی ئیجتیهاد و تێڕامان دەكەن ناكرێ كەسی لەسەر تەكفیر بكرێت و بە بنەما و ئەسڵی عەقیدە و دین دابنرێن و خەڵكیان لەسەر موحاسەبە بكرێت، كەواتە جەماوەری موسڵمانان لەسەر بنەما نەگۆڕە قەتعییەكانی وەك (بوونی خودا، زیندووبوونەوە، وەحی، پێغەمبەرایەتی،...) هاوڕان، ئەوەی تر دەبێتە مەزهەب و مەنهەج، مەنهەجی یەكێكیان عەقڵییە و هی یەكێكی دیكە نەقڵی و هی یەكێكی دیكە تێكەڵ لە نەقڵ و عەقڵ، هی یەكێكیان نزیكتر لە وەحی و هی یەكێكی تر دوورتر، هەروەك چۆن لە فیقهیشدا ئەهلی ڕەئی و ئەهلی حەدیس هەیە، ئەم دوانەش مەنهەج و مەزهەبیان جیاوازە، نەوەك دینیان لەیەك جیاواز بێت. كەواتە ئەوەی گرینگە ئەوەیە ئێمە جیاكاری بكەین لە نێوان (مذهب) ڕێباز و (منهج) میتۆد و (عقیدة) بیروباوەڕ و قەتعیات و ظەنیات و كولیات و جوزئیاتدا.

# کوفــر

کوفر لەڕووی زمانەوانییەوە واتە: شاردنەوە و داپۆشین، بۆیەش بە جوتیار دەوترێت (کافر) چونکە تۆ دەشارێتەوە و دایدەپۆشێت.

کوفر لەڕووی زاراوەوە واتە: هەموو شتێک کە ئیمانداری پێ کافر و بێباوەڕ ببێت.

کوفر مانا ئەسڵیەکەی واتە: هەموو شتێک کە ئیمانداری پێ کافر و بێباوەڕ ببێت، بەڵام ئەم شتە چییە؟ ئەمە ڕاجیاییەکی زۆر تێدایە لە نێوان زانایانی کەلام و قوتابخانە کەلامییەکاندا، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. ئەوانەی پێناسەی ئیمانیان بە زانین و مەعریفە و ناسین و ناسینی خودا پێناسە کرد، ئەوە کوفر لای ئەوان بریتییە لە نەزانی و نەناسینی خودا و پەیامەکەی. ئەمە ڕای جەهەمییەکانە.

٢. ئەوانەی پێناسەی ئیمانیان بە بەڕاستدانان کرد لای ئەوان کوفر بریتییە لە بەدرۆدانان و بەڕاستدانەنان. ئەمەش ڕای مورجیئەکان و بەشێکی زۆری زانایان و ئەشعەری و ماتوریدییەکانە. بە جیاوازی هەندێ وردە باس.

**٣.** ئەوانەی ئیمانیان بە گوێڕایەڵی و کاروکردەوە و کردنی واجبەکان و نەکردنی حەڕامکراوەکان پێناسە کرد، ئەوە کوفر لای ئەمان بریتییە لە گوناهی گەورە و گوێڕایەڵی نەکردن. ئەمەش ڕای خەواریجەکان و موعتەزیلەکانە، بەڵام ئەمانیش هەندێ جیاوازییان هەیە کە لە باسەکانی پێشوو باسمان کرد.

**٤.** ئەوانەی ئیمانیان بە زانین و بەڕاسدانانی دڵ و داپێدانانی زمان و کاروکردەوەی ئەندامەکان پێناسە کرد، کوفر لایان بریتییە لە کەموکوڕی لەم سێ بەشەدا. ئەمەش ڕای زۆری سەلەفیەت و ئەهلی حەدیسە.

**٥.** ئەوانەی ئیمانی بە دانپێدانانی زمان پێناسە کرد، کوفر لایان دانپێدانەنانی زمانە. ئەمەش ڕای کەڕامییەکانە.

## جۆرەکانی کوفـر

زانایانی کەلام کوفریان کردۆتە چوار جۆر

**١.** کوفری نکۆڵی کردن (كفر إنكار): بریتییە لەوەی بە دڵ و زمانی کوفر بکات و دان نەنێت بەهیچ شتێکی ئایین و خواداناسی.

**٢.** کوفری سەرکەشی (كفر عناد): بریتییە لەوەی بە دڵ باوەڕی هەیە و بە زمانیش باوەڕ دەردەبڕێت، بەڵام ملکەچی ئەو باوەڕەی نابێت.

**٣.** کوفری دانپێدانەهێنان (كفر جحود): بریتییە لەوەی کە بەدڵ بزانێت بەڵام بە زمان دانیپێدانەنێت و دەری نەبڕێت، وەک کوفری شەیتان.

**٤.** **کوفری دووڕوویی (کفر نفاق): بریتییە لەوەی بە زمان باوەڕ دەردەبڕێت، بەڵام بەدڵ باوڕی پێی نییە.**

## چەند جۆرێکی تری کوفر

**١.** **کوفری بیروباوەڕی: ئەوەیە کە بیروباوەڕی بە خوا و ئیسلام نییە.**

**٢.** **کوفری گوفتاری: ئەوەیە بە وتە شتێک دەڵێت کە کوفرە و پێی کافر دەبێت.**

**٣.** **کوفری کرداری: ئەوەیە کە بەکردار شتێک دەکات کە پێی کافر دەبێت چونکە کارێکی کوفرییە.**

**دەشکرێ کەسێک هەرسێکی هەبن، یان دوو، یان یەک.**

**بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کوفری ئیعتیقادی و بیروباوەڕی لە هەموویان مەترسیداترە.**

**بەڵام لە هەرسێکیشیاندا جیاڕایی هەیە لەوەی کە چ شتێک کوفرە چ شتێک کوفر نییە، بەڵام هەندێ شتی کۆندەنگی لەسەریش هەیە.**

**وە ئەوەشی پێناسەی ئیمان بەس بە زانین یان بەڕاستدانانێکی ڕووت دەکات، ئەوە لای ئەو کوفر بەس کوفری ئیعتیقادییە نەک کردار و گوفتار.**

## ڕاڤەکردنی ئەو شتانەی بەکوفر ناوبراون لە دەقەکاندا بەڵام کوفری ئەسڵیش نیین

ئێمە هەندێ دەقمان هەیە، کە دەفەرموێت: ئەگەر وابکات یان وا نەکات ئەوە کافر دەبێت، ئەم دەقانە چەند ڕاڤەکیان بۆ کراوە:

**١.** دەفەرموون: ئەگەر بە حەڵاڵی بزانێت، ئینجا پێی کافر دەبێت، بۆنموونە زیناکار کافر نییە، بەڵام ئەگەر پێی حەڵاڵ بێت ئەوە پێی کافر دەبێت.

**٢.** کردەوەکە بە کردەوەی کافران و کوفر دەچێت بۆیە وا ناونراوە، نەک خۆی کوفر بێت.

**٣.** ڕەنگە سەربکێشێت بۆ کوفر، نەک خودی خۆی کوفر بێت.

**٤.** یان مەبەستی کوفری نیعمەتە، واتە کوفرانەی نیعمەتی کردووە، نەک کوفری ڕاستەقینە.

کەواتە کە وشەی کوفرت بینی لە دەقەکاندا نابێ ڕاستەوخۆ بە کوفری حەحقیقی لێکی بدەیەوە، چونکە جۆر و لێکدانەوەی زۆری هەیە.

# تەکفیر

تەکفیر دەستەواژەیەکی دینیە بە واتای بەکافردانان و کافرکردن دێت.

## بنەماکانی تەکفیر :

تەکفیر یەکێکە لە هەستیارترین و مەترسیدارترین بابەتەکان، بۆیە زانایان زۆر لەم بابەتەیان کۆڵیوەتەوە و توێژینەوەی ورد و قووڵیان بۆی کردووە، ئێمەش لێرەدا چەند بنەمایەک لە بنەماکانی تەکفیر باس دەکەین:

١. هەرکەسێک حوکمی موسڵمانبوونی لەسەر چەسپا بێت و موسڵمان بوونەکەی ئاشکرا و ڕوون بێت ئەوا ئەو وەسفەی لەسەر لاناچێت مەگەر بەڵگەیەکی یەقینی و بێگومانی بێت ئەو وەسفەی لەسەر لاببات.

٢. موسڵمان بە کوفری گەورە نەبێت لە ئیسلام دەرناچێت، کوفری بچووک موسڵمان دەرناکات لە ئیسلام.

٣. تەکفیر حوکمێکی شەرعییە هەر بۆیە بەڵگەیەکی قەتعی نەبێت ناچەسپێت.

٤. لە تەکفیری دیاریکراودا پێویستە مەرجەکان بێنەجێ و ڕێگرییەکانیش نەمێنن.

**٥.** تەکفیر پێویستی بە ئیقامە حوججە هەیە و بەبێ ئیقامە حوججە ناچەسپێت.

**٦.** گوناه و تاوان موسڵمان ناخەنە دەرەوە لە ئیسلام، بەڵکوو بەس پێی گوناهبار دەبن.

**٧.** پێویستە گومانی باش بە برا و خوشەکانمان ببەین و تەکفیر نەکەینە ئامانج.

**٨.** تەکفیر حوکمێکە نابێت هەموو کەسێک پێی هەستێت.

## ڕێگرییەکانی بەردەم تەکفیر

**١.** نەزانی

**٢.** هەڵەکردن

**٣.** تەئویل

**٤.** زۆرلێکردن

**٥.** تەقلید

واتە ئەگەر کەسێک بە نەزانی تووشی کوفر بوو و نەشی توانیبوو فێرببێت، ئەوە تەکفیر ناکرێت، یان بەهەڵە کەوتە کوفرەوە، یان ئەهلی تەئویل بوو و تەئویلی کرد و کەوتە کوفرەوە، یان زۆری لێکرا بۆئەوەی کوفر بکات نەشی توانی خۆ بۆ ئازارەکانی بگرێت، یان بە تەقلید کەوتە کوفرەوە، ئەوا لەم حاڵەتانەدا تەکفیری ئەم کەسانە ناکرێت و نابێت تەکفیر بکرێن.

# توندڕەوی و ڕەهەندەکانی

توندڕەوی تەوژمێکی تازە نییە و بەدرێژایی مێژوو بوونی هەبووە، هەروەها تایبەت نییە بە بیر و فکر و ئایینێکی دیاریکراوەوە، بەڵکوو شتێکی گشتییە، لەناو مێژووی موسڵمانانیشدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەواریج... تەوژمە توندڕەوەکان جۆریان زۆر زۆرە، بە درێژایی مێژوو بە دەیان و سەدان تەوژمی توندەڕەو هەبووە کە کەسیان بە کەس ڕازی نەبووە و زۆرێکیان یەکتریا تەکفیرکردووە.

## * سیما و بیرو ڕاکانی تەوژمی توندڕەوی:

١. تەکفیر، تەکفیر لای ئەو تەوژمە زۆر سادە و ئاسانە، هەرکەسێک تۆزقاڵێک لابدات، لایان ئاسانە تەکفیری بکەن. بۆیە لای ئەوان ئەوانەی گوناهی گەورە دەکەن هەموویان کافرن، یان دەستەڵاتدارانی غەیری خۆیان تەکفیر دەکەن، ئەوەی لەژێر سایەی ئەو دەستەڵاتانەش بێت تەکفیریان دەکەن چونکە دەڵێن ڕازین بەوان، هەتا کاتی خۆی خەواریجەکان ئیمامی عەلی و عوسمان و معاویە و عائیشە و تەڵحە و زوبێر و هەموو ئەوانەشی لەگەڵیان بوون تەکفریان دەکردن.

٢. زۆرێکیان هیچ ئیعتیبارێک بۆ زانایان دانانێن، هەتا هەیانە شافعی و حەنەفی و چەندانی تریشیان پێ کافرن.

٣. گومان بردنی خراپ بە هەموو خەڵکی جگە لە خۆیان

٤. واقیعی نەبوون

٥. دابڕان لە کۆمەڵگە

٦. پەلەکردن لە شتەکاندا و بەکارنەهێنانی پلەبەندی

٧. بەکارهێنانی هێز بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان

٨. قبووڵ نەکرنی بیروڕای بەرانبەر

٩. بێبەزەییبوون

١٠. کەمی زانست و زانیاری، بۆیە زۆرێکیان شارەزاییێکی وایان لە زانستی شەرعیدا نییە.

١١. زاهیریبوون لە تێگەیشتنی دەق

١٢. بڕوانەبوون بە گفتوگۆ

١٣. بڕوایان وایە بەس ئەوان لەسەر حەقن و خەڵکی هەموو یان کافرن یان گومڕان یان نەزانن.

١٤. بەکارهێنانی هێز و زەبر و زەنگ بۆ چەسپاندنی بیروڕاکانیان

١٥. زاهیریبوون لە عیبادەت و پەرستنشدا

١٦. وشکی و توندی لە بانگەوازدا

١٧. گرنگیدانی لەڕادەبەدەر بەجوزئیات و شتەلاوەکی و فەرعییەکان

**١٨.** بەسوک سەیریکردنی غەیری خۆیان و خۆ لێ گۆڕان و لەخۆباییبوون

**١٩.** ڕەچاونەکردنی فیقهی ئەولەویات

**٢٠.** مەقاسیدینەبوون و نەخوێندنەوەی مەبەستەکانی شەریعەت.

**٢١.** پەراوێزخستن یان حیساب نەکردن بۆ عەقڵ و ئەزموون و سیاسەی شەرعی.

## هۆکارەکانی توندڕەوی

**١.** تێگەیشتنی نادروست و هەڵە

**٢.** نەزانی و بێئاگایی لە قورئان و سوننە

**٣.** نەزانی و بێئاگایی لە ڕووحی ئیسلام و مەقاسیدی شەریعە

**٤.** نەزانی و بێئاگایی لە پێناسەی ئیمان و ڕوکنەکانی

**٥.** نەزانی و بێئاگایی لە جۆر و ئاستی خەڵک

**٦.** پەلەکردن و هەڵپەکردن و هەڵەشەیی

**٧.** نەخوێندنەوەی باردۆخ و ژینگە و کات و شوێنەکان

**٨.** دەمارگیری و تەعەسووب

**٩.** تێکچوونی باری دەروونی

**١٠.** هەڵچوون

**١١.** پەروەردەی نادروست

**١٢.** پەرتووک و نووسراوی توند و نامەنهەجی و پەڕگیر

**١٣.** نائومێدی و بێهیوابوون

**١٤.** پیلانگێڕی دوژمنانی ئیسلام و دەستی دەرەکی و هۆکار و هاندانی دەرەکی

**١٥.** نەبوونی کیان و دەوڵەتی سەربەخۆ

**١٦.** ڕاگەیاندن و ئاڕاستەکردنە نادروستەکانی

**١٧.** بانگخوازە ناتێگەیشتووەکان

**١٨.** ستەم و ستەمی سەرکردەکان

**١٩.** تێکچوونی پەیوەندی دەستەڵاتداران و گەل

**٢٠.** سوکایەتی کردن بە ئیسلام و بریندارکردنی هەست و سۆزیان

**٢١.** تێکچوونی بارودۆخی ئابووری و تەقینەوی کۆمەڵگە لە دژی

**٢٢.** جێبەجێ نەکردنی ئەرکی سەرشانیان لەلایەن هەندێک لە زانایان و بانگخوازان و نووسەران

**٢٣.** شکستپێهێنانی پرۆسە سیاسییەکان و دوورخستنەوەی ئەوانەی بە دەنگی خەڵک هاتوون و هەڵبژێردراون.



٢٤. تەئویل و تەفسیری لادەرانە بۆ دەقەکان

٢٥. دەقگەرایی و زاهیریبوون

٢٦. کۆنەکردنەوەی دەقەکان بەیەکەوە

## کاریگەرییەکانی توندڕەوی

١. تێکدانی ئەمن و ئاسایش

٢. لەناوبردنی برایەتی و خۆشەویستی

٣. کاولکاری

٤. ستەم و ستەمکاری

٥. هێنانەدی ئاواتی دوژمنان

٦. کوشت و کوشتار

٧. هەتیو خستن و بێوەژن خستن

٨. تێکدانی شیرازەی تاک و خێزان و کۆمەڵگە و دەوڵەت و سیاسەت

٩. ناشیرین کردنی ئایین

## چارەسەری توندڕەوی

١. تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست بۆ ئیسلام

٢. خوێندن و خوێندوەی عەقیدە و بیروباوەڕێیکی پاک و دوور لە زیادەڕەوی و کەم ڕەوی

٣. بەدواکەوتنی مەنهەج، نەک کەس

٤. زاهیرینەبوون لە تێگەشتنی دەق

٥. وریابوون و حەزەر کردن و بیرکردنەوە لە دەرەنجامە خراپەکانی توندڕەوی و تەکفیر

٦. ڕوانینی میانڕەوانە بۆ توراس و کەلەپور و قسە و مەزهەبی زانایان و بەپیرۆز سەیرنەکردنیان، لە هەمان کاتدا سود وەرگرتن لێیان و دانەبڕان لێیان، واتە نە بە پیرۆز سەیریانکەی نە بە سووک و کەم، بەڵکوو بەردەوام وەک سەروەتێکی گەورە لێیان بڕوانی و سوودیان لێوەرگری، بەڵام لێت نەبن بە ئەسڵی دین و خەڵکیان لەسەر تەکفیرکەی.

٧. واقیعیبوون، نەک خەیاڵیبوون

٨. خۆت لێ نەبێتە حاکم و قازی و بڕیاڕ لەسەر خەڵک بدەی، چونکە تۆ یان فێرخوازی یان بانگخوازی یان زانا، کەواتە دەبێت ئەم چەمکانە ڕەچاوبکرێن و هەرچی ڕاستبۆە خۆی لێ نەبێت بە قازی و خەڵک تەکفیر کات، زۆر جار هەندێک گەنج دوو وشە عەرەبی دەزانن و یەک دوو نامیلکەیان خوێندۆتەوە گوێیان لە یەک دوو وتار بووە دێن خەڵک و زانا و بانگخوازان تەکفیر دەکەن!!! بەڕاستی کارەساتە.

٩. گرینگیدانێکی قووڵ بە سیاسەی شەرعی و هێڵە گشتییەکانی شەریعەت و ئیسلام و بەقوربان نەکردنی کلیاتی شەریعەت بۆ جزئیات.

لەکۆتاییدا تەوژمی تەکفیری بە درێژایی مێژوو لە غەیری ماڵوێرانی هیچی تری پێنەبووە، بۆیە پێویستە لە کرۆکی ئیسلام تێبگەین و خۆمان لە شتێک نەدەین کە کاری ئێمە نییە، سەدان کار و خزمەت لەولاوە بێناز کەوتووە، بەڵام دەچن یێخەی تەکفیر دەگرن!!!

با ئەوەشمان لەبیر نەچێت، زۆر جار سەرچاوەی توندڕەوی غەیری ئیسلام و موسڵمانە، جا یان ئەوان پاڵنەرن یان پشتگیری دەکەن یان زۆرجار بە ئەنقەست گروپە توندڕەوەکان دروست دەکەن بۆ مەرام و مەبەستی خۆیان، زۆرجاریش گەورەترین خزمەتە بەوان.

**تێبینی:** زیاتر مەبەستمان ئەو توندڕەوییە بوو کە بەناوی ئیسلامەوە دەیکەن، ئەگەرنا وەک وتمان توندڕەوی تایبەت نییە بە ئایین یان بیرێکی دیاریکراوەوە، بەڵکوو گشتییە، ئەگەرنا ئەگەر باسی توندڕەوی غەیری ئیسلامیش بکەین ئەوە زۆر زیاترە و ئەوەی ئەوان کردویانە بەدرێژایی مێژوو زۆر زۆر زیاترە.

ئەوەی گرینگە لێرەدا ئەوەیە ئێمە لە مێژوودا نەژێین بەڵام سوودی لێببینین، بۆ نموونە خەواریج ڕێبازێکی سیاسی کەلامی فکری عەقیدەیی سەربازی بوون و تێپەڕین، بەڵام لە هەموو سەردەمەکاندا بەشێوە و شێواز و سیما و ناو و ڕەنگی جیاواز سەرهەڵدەدەنەوە، کە پێویستە بیانناسین و مامەڵەی هەستیاریان لەگەڵدا بکەین، ئەگەرنا وەک خودی ناوەکە خەواریج کۆمەڵە گروپێک بوون و تێپەڕین.

## مامەڵەی دروست لەگەڵ زانایان و ڕاجیایی و جیاوازییەکاندا (بەتایبەت لە بوارە عەقیدەیی و فیقهی عەقیدەیی و فکرییەکاندا)

لێرەوە بەپێویستی دەزانم هەندێ یاسا و بنەمای گشتی بخەمەڕوو بۆ مامەڵەی درووست لەگەڵ زانایان و جیاڕایی و ئیختیلاف و جیاوازییەکان و بابەتەکانی فیقهی عەقیدە.

١- الْحَذَرُ مِنَ الْإِكْثَارِ فِي الرُّدُودِ

ئاگاداربوون و دووربوون لە ڕەددانەوە و وەڵامدانەوەی زۆر و لەڕادەبەدەر

٢- عَدَمُ النَّقْدِ الغَيْرِ الْمُنْصِفِ

ڕەخنەنەگرتنی نابەجێ و بێ ئینسافانە

٣- الْعَدْلُ مَعَ الْمُخَالِفِينَ

دادگەری لەگەڵ موخالفەکاندا

٤- مُرَاعَاةُ النَّتَائِجِ فِي الْأَقْوَالِ وَالْأَفْعَالِ وَالْمَوَاقِفِ وَالْاِجْتِهَادَاتِ ( مُرَاعَاةُ فِقْهِ الْمَآلَاتِ )

ڕەچاوکردنی سەرەنجامی گوفتار و ڕەفتار و هەڵوێست و ئیجتیهادەکان

٥- الْاعْتقادُ بأَنَّ الْمَعْصيَةَ وَالْخَطيئَةَ وَالْكَبيرَةَ لَا تُخْرِجُ صَاحِبَهَا مِنَ الدِّينِ وَلَا يَقْطَعُ الْمُوَالَاةَ مَا لَمْ يَسْتَحِلَّهَا

باوەڕبوون بەوەی کە گوناهو تاوان و هەڵە و گوناهی گەورە خاوەنەکەی لە ئایین دەرناکات و دۆستایەتیش ناپچڕێنێت مادام بە حەڵاڵی نەزانێت

٦- الْانْتِفاعُ مِنَ الْمُخَالِفِ

سوود بینین لە موخالیف

٧- قَصْدُ هِدَايَةِ الْمُخَالِفِ عِنْدَ الْاخْتِلَافِ

لەکاتی جیاوازی و ڕاجیاییدا لەگەڵ جیاواز و موخالیفەکاندا مەبەستت هیدایەتدانیان بێت نەوەک شتی تر

٨- عَدَمُ التَّسْوِيَةِ بَيْنَ الْمُخَالِفِينَ، وَهُمْ في مَنَازِلٍ مُتَفَاوِتَةٍ

یەکسانی نەکردن لەنێوان موخالیفەکاندا، چونکە ئەمانیش جۆر و پلە و ئاستی جۆراوجۆریان هەیە

٩- الصَّبْرُ عَلَى أَذَى الْمُخَالِفِينَ

ئارامگرتن لەسەر ئەزیەت و نارەحەتییەکانی موخالیفەکان

١٠- الْمُحَافَظَةُ عَلَى السَّكِينَةِ الْاجْتِمَاعِيَّةِ وَأَمْنِهَا عِنْدَ الْاخْتِلَافِ

پارێزگاری کردن لە ئارامی و ئاشتی کۆمەڵایەتی لە کاتی جیاوازییەکاندا

**١١- نُصْرَةُ الْمُخَالِفِينَ عِنْدَ الْبَغْيِّ عَلَيْهِمْ وَالظُّلْمِ**

سەرخستنی موخالیفەکان لەکاتی دەستدرێژی کردنە سەریان و ستەم لێکردنیان

**١٢- عَدَمُ تَسْمِيَةِ الْمُخَالِفِينَ بِمَا لَا يُحِبُّونَهُ وَلَا يَرْضُونَ بِهِ وَلَا يَنْطَبِقُ عَلَيْهِمْ**

ناونەنانی موخالیفەکان بە ناوێک کە پێیان خۆش نییە و پێی ڕازی نین یان هەر لەسەریان جێبەجێ نابێت

**١٣- الْوَسَطِيَّةُ وَعَدَمُ الْعُنْفِ وَالتَّطَرُّفِ**

میانڕەوی و ناوەندگیری و دووربوون لە توندوتیژی و پەڕگیری (تەڕەفگیری)

**١٤- الْتَّوَاْزُنُ بَيْنَ ثَوَابِتِ الشَّرَعِ وَمُتَغَيِّرَاتِ الْعَصْرِ**

هاوسەنگی ڕاگرتن لە نێوان نەگۆڕەکانی شەریعەت و گۆڕاوەکانی سەردەم

**١٥- التَّوَازُنُ بَيْنَ كَسْبِ الْقُلُوبِ وَكَسْرِ الْقُلُوبِ**

هاوسەنگ بوون لە نێوان دڵڕاکێشان و دڵشکاندندا

**١٦- التَّوْحِيدُ وَالْاِبْتِعَادُ عَنِ الشِّرْكِ**

یەکتاپەرستی و دووركەتنەوە لە شیرك و هاوبەش دانان بۆ خودا

**١٧- عَدَمُ التَّصَرُّفِ الْمَصْلَحِيِّ مَعَ النُّصُوصِ**

مامەڵەنەکردن لەگەڵ دەقدا بە مامەڵەکردنێکی بەرژەوەندی خوازانەتَجْدِيدُ التُّرَاثِ بَدَلَ تَمْجِيدِهِ وَتَجْمِيدِهِ

نوێگەری لە توراس و کەلەپوردا لەبری چەقبەستوویی و بە پیرۆزدانان

**١٨- عَدَمُ مُحَاوَلَةِ رَفْعِ الْخِلاَفِ فِي الْفُرُوعِ**

هەوڵنەدان بۆ لابردنی جیاوازی و ڕاجیایی لە شتە فەرعی و جوزئییەکاندا

**١٩- عَدَمُ الْإِنْكَارِ عَلَى الْمُخَالِفِ فِي الْمَسَائِلِ الْخِلاَفِيَّةِ**

ئینکاری نەکردن و نکووڵی و دژایەتی نەکردنی ئەوانەی هاوڕا نین لەگەڵتدا لەو بابەتانەی جیاوازی و ڕاجیایی هەڵدەگرن

**٢٠- عَدَمُ تَنْزِيلِ فَهْمِ الْإِنْسَانِ مَنْزِلَةَ الدِّيْنِ وَإِلْزَامِ النَّاسِ بِهِ**

نەکردن و دانەنانی بۆچوون و تێگەیشتنی مرۆڤ بە دین و پەیوەستنەکردن و پابەندنەکردن و نەبەستنەوەی خەڵکی پێیانەوە

**٢١- عَدَمُ صبْغِ الْمَسَائِلِ الدِّينِيَّةِ بِطَبِيعَةٍ بَشَرِيَّةٍ وَالطَّبِيعَةُ الْبَشَرِيَّةِ بِصِبْغَةٍ دِينِيَّةٍ**

ڕەنگنەکردن و بەرگی ئایینی نەکردنە بەری خوو و سروشتە ئادەمییەکان و بە پێچەوانەشەوە نەکردنی مۆرک و سروشتە ئادەمییەکان بە دین و ڕەنگ و بەرگی ئایینی کردنە بەریان

**٢٢- مُرَاعَاةُ الْبِيئَاتِ وَالْأَحْوالِ فِي بِنَاءِ الْأَحْكَامِ وَالْمَوَاقِفِ**

ڕەچاو کردنی ژینگە و حاڵ و بارودۆخەکان لەکاتی بڕیاردان و حوکمدان و مامەڵە کردن و هەڵوێست وەرگرتندا

**٢٣- الْاعْتِدالُ فِي التَّقْلِيدِ وَالتَّمَذْهُبِ بَيْنَ الْإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطَ**

تێڕوانین و مامەڵەیەکی دروست و هاوسەنگ لەگەڵ (تەقلید) و (مەزهەبی) بوون لە نێوان زیادەڕەوی و کەم ڕەویدا

**٢٤- الْاعْتِقادُ بِأَنَّ الْمُخْطِئَ فِي الْاجْتِهَادِ - مَادَامَ مِنْ أَهْلِهِ - مَعْذُورٌ وَمَأْجُورٌ**

باوەڕبوون بەوەی کە ئەگەر موجتەهیدێک (زانایێک) هەڵەی کرد لە ئیجتیهاد و ڕەئیەکەی – بەو مەرجەی شیاو و شایستە و پیاوی ئەو مەیدانە بێ - پاداشت وەردەگرێت و دەبێ عوزری بۆ بهێنرێتەوە

**٢٥- عَدَمُ تَأْدِيَةِ الْخِلاَفِ الْفِقْهِيِّ وَالْفُرُوعِ الْعَقَدِيَّةِ إِلَى التَّفْرِقَةِ وَالْبُغْضِ وَالْعَدَاوَةِ**

سەرنەکێشانی جیاوازی -خیلافی فقهی -هەروەها بابەتگەلێکی ناسەرەکی عەقیدەیی بۆ پارچە پارچە بوون و پەرتەوازەیی و ڕق و قینە و دابڕان و دوژمنایەتی و لێکخوێندن

**٢٦- إِرْجَاعُ الْأَقْوَال وَالْأَفْعَال وَالْمَوَاقِف ( الْفَتَاوَى، الْاجْتِهَادَاتِ، الْآرَاءِ ) إِلَى زَمَانِهَا وَمَكَانِهَا وَوَاقِعِهَا، وَفَهْمُهَا فِيهَا**

ڕەچاوکردن و گێڕانەوەی قسە و کار و هەڵوێست (فەتوا، ئیجتیهاد، ڕاو و بۆچوون) بۆ ئەو سەردەم و شوێن و بارودۆخەی کە تێیدا گوتراوە و کراوە، هاوکات لەگەڵ ئەوانەدا تێگەیشتنیان لە ژێر ڕۆشنایی ڕەچاوکردنی ئەمانەدا

**٢٧- التَّوَسُّطُ بَيْنَ الْإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ فِي فَهْمِ الْبِدْعَةِ**

هەڵوێستی ناوەندگیر و ئەمپەر و ئەوپەڕنەگیری دەربارەی بیدعە

**٢٨- الْاِعْتِقَادُ بِأَنَّ الْاِخْتِلَافَ فِي الْفِقْهِ وَفُرُوعِ الْعَقِيدَةِ طَبِيعِيٌّ وَوَاقِعٌ**

بڕوابوون بە تێڕوانینی جیاواز لە فیقە و بوارە لاوەکی و ناسەرەکییەکانی عەقیدە

**٢٩- عَدَمُ الْاعْتقاد بِأَنَّ الْخَطَأَ فِي التَّأْوِيلِ وَالْاِجْتِهَادِ يُخْرِجُ صَاحِبَهُ مِنَ الدِّينِ، وَيَقْطَعُ اَلْمُوالاةَ أَوْ يَنْقُصُهَا**

بڕوانەبوون بە دەرچوون لە دین بەهۆی تەئویل و ئیجتیهادی هەڵەوە، وە پچڕاندن یان کەمکردنەوەی پەیوەندی و دۆستایەتی و لەگەڵ یەکبوون بەم هۆیەوە

**٣٠- عَدَمُ ادِّعَاءِ الْعُلَمَاءِ بِأَنَّ الصَّوَابَ مَعَهُمْ فِي جَمِيعِ اِجْتِهَادَاتِهِمْ ( صَرَاحَةً أَوْ دَلَالَةً )**

بانگەشەنەکردنی زانایان و کەسانی شارەزا بەوەی کە ڕاستی تەنها و تەنها لەلای ئەوانە و بەس ئەوان ڕاست و حەقن، جا ئەم بانگەشەیە یان بە ڕاشکاوی دەکرێت یان بە ناڕاشکاوی

٣١- الْاعْتِدالُ فِي تَقْيِيمِ الْعُلَمَاءِ وَالْمَذَاهِبِ وَالتُّرَاثِ وَالْأَفْكَارِ وَالْآرَاءِ

دادپەروەری و ئینساف لە هەڵسەنگاندنی زانایان و ڕێڕەو و مەزهەبەکان و توراس و ئەفکارەکان و بیر و ڕاکان

٣٢- عَدَمُ الْاعْتِقادِ بِأَنَّ نَقْدَ الْآرَاءِ يَعْنِي الطَّعْنَ فِي أَصحَابِهَا

باوەڕنەبوون بەوەی کە ڕەخنەگرتن لە بیر و ڕای کەسانێک یەکسانە بە تانە و تەشەردان لە خاوەنەکانیان

٣٣- تَجَنُّبُ الصِّيَاغَةِ الْاعْتِقادِيَّةِ لِلْخِلاَفَاتِ الْفَرْعِيَّةِ

دوورکەوتنەوە لە بە عەقیدەییکردنی جیاوازییە لاوەکییەکان

٣٤- عَدَمُ الْإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ فِي التَّأْوِيلِ وَالتَّفْرِيقُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ التَّحْرِيفِ

زیادەڕەوەی نەکردن و کەمڕەوی نەکردن لە تەئویلکردندا، وە جیاوازی کردن لە نێوان تەئویل و تەحریف و شێواندندا

٣٥- عَدَمُ إثارَةِ الْخِلاَفِ الْمَوْجُودِ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ وَالدُّعَاةِ وَالْجَمَاعَاتِ عِنْدَ عَوَامِّ النَّاسِ

نەوروژاندنی جیاوازی نێوان زانایان و بانگخوازان و گروپەکان و کۆمەڵەکان لە لای خەڵکی عەوام

٣٦- الرُّجُوعُ إِلَى الْحَقِّ (بَعْدَ ظُهُورِهِ)

گەڕانەوە بۆ حەق و ڕاستی لەدوای ئەوەی بۆی ڕوونبۆوە

٣٧- عَدَمُ حَمْلِ كَلَامِ الْمُخَالِفِ عَلَى أَسْوَئِهِ وَأَقْبَحِهِ

لێکنەدانەوە و شرۆڤەنەکردنی قسەی ئەوانەی هاوڕانین لەگەڵت بە ناشیرینترین و بێزراوترین شێواز

٣٨- تَجْرِيدُ الدَّعْوَةِ مِنَ التَّعَصُّبِ الْحِزْبِيِّ وَالشَّخْصِيِّ وَالطَّائِفِيِّ وَ...

بەدوور گرتن و داماڵین و - خاڵی کردنەوەی - بانگەواز و کاری ئیسلامی لە دیاردەی دەمارگیری مەزهەبی و پێڕگەرایی تائیفی و بە کەسێتیکردنی کارەکان

٣٩- عَدَمُ تَصْحِيحِ الآخَرِينَ أَوْ نِصْحِهِمْ فِي الْعَلَنِ

ئامۆژگاری نەکردن و ڕاست نەکردنەوەی کەسی بەهەڵەداچوو و تاوانبار بە بەرچاوی خەڵکەوە و بە ئاشکرا

٤٠- عَدَمُ الْمُنَاقَشَاتِ وَالْحِوَارَاتِ فِي الْعَلَنِ

گفتوگۆ نەکردن لەبەر چاوی خەڵک و بە ئاشکرا

٤١- اتِّخَاذُ الحِوَارِ وَسِيلَةً لِلْوُصُولِ إِلَى الْحَقِّ وَالْحَقِيقَةِ

بەکارهێنانی گفتوگۆ وەک هۆکار و ڕێگاییێک بۆ گەیشتن بە ڕاستی و حەقیقەت

٤٢- عَدَمُ رَفْضِ إِمْكَانِ تَعَدُّدِ الصَّوَابِ

باوەڕبوون بە چەندایەتی دەرئەنجامی جۆراوجۆر و دروست و پێکانی چەند لایەنە و زیاد لە ڕوییێک و ڕەت نەکرنەوە و وەلانەنانی

**٤٣- عَدَمُ الادِّعَاءِ بِأَنَّ الْمُخَالِفَ مُخْطِئٌ دَوْمًا (صَرَاحَةً أَوْ دَلَالَةً)**

بانگەشەنەکردن و بڵاونەکردنەوەی دەنگۆی ئەوەی کە کەسی بەرامبەر - ئەوانەی کە خاوەنی ڕای جیاوازن - هەمیشە لە هەڵەدان و بە هەڵەدا چوون و لایانداوە

**٤٤- التَّمْيِيزُ بِيْنَ الْخَطَأَ وَالْخَطِيئَةِ وَبَيْنَ الْقُصُورِ وَالتَّقْصِيرِ**

جیاوازیکردن و لێککردنەوەی نێوان هەڵەیەک کە بە نەزانی دەکرێ لەگەڵ هەڵەیەک کە بە زانین و ئاگاییەوە دەکرێت، یان لە نێوان نەبوونی توانا و دەستەوەستانی لەگەڵ کەمتەرخەمی و گوێ پێنەدانی

**٤٥- عَدَمُ الاشْتِغَالِ فِيمَا لَا يُدْرَكُ بِالْوَحْيِ وَالْعَقْلِ وَالْعِلْمِ وَالْحَوَاسِّ**

خۆسەرقاڵ نەکردن بەو بابەتانەی کە نە لە ڕێی وەحی نە عەقڵ و نە زانست ونە هەستەکان پەیان پێ نابرێ

**٤٦- عَدَمُ إِثَارَةِ الْمَسَائِلِ الْعَقَدِيَّةِ وَالْفِكْرِيَّةِ وَالْفِقْهِيَّةِ الْمُخْتَلَفِ فِيهَا بَيْنَ عَوَامِّ النَّاسِ**

نەوروژاندنی بابەتگەلێکی عەقیدەیی و بیروباوەڕ و فیکری و فیقهی لەناو خەڵکی سادە و ڕەشۆکی -عەوام - کە زانایان تێیاندا کۆڕا نین و جیاوازن

**٤٧- عَدَمُ الاهْتِمَامِ بِالْجُزْئِيَّاتِ عَلَى حِسَابِ الْكُلِّيَاتِ**

گرینگی نەدان بە بابەتە - شتە - لاوەکییەکان لەسەر حسابی بابەتە گشتی و سەرەکییەکان

**٤٨- عَدَمُ الْمُجَادَلَةِ وَالْبَحْثِ فِي مُفَاضَلَةِ الْعُلَمَاءِ بَعْضِهِمْ عَلَى بَعْضٍ**

دمبەدمە و شەڕە قسە نەکردن لەسەر ئەو زانا و ئەم زانا و باوەنەدان و بە بەرزتر دانەنانی هەندێکیان بە سەر هەندێکی تریاندا

**٤٩- عَدَمُ الاشْتِغَالِ وَالْخَوْضِ فِي الْمَسَائِلِ الَّتِي لَا يُبْنَى عَلَيْهَا عَمَلٌ**

سەرقاڵ نەبوون و ڕۆنەچوون و نەچوونە ناو کۆمەڵە بابەتێک کە کردەیی نین و کاریان لەسەر بنیات نانرێت و هیچ سوودێکیان نییە نە بۆ مرۆڤ و مرۆڤایەتی نە بۆ ژیان و نە بۆ ئیسلام

**٥٠- التَّعَاوُنُ فِي الْمُتَّفَقِ عَلَيْهِ وَالتَّسَامُحُ وَالاِحْتِرَامُ فِي الْمُخْتَلَفِ فِيهِ**

هەبوونی گیانی هاوکاری و دەستبار بۆ یەکگرتن لەسەر ئەو کارانەی کە کۆک و هاوڕاین تێیاندا هاوکات لەگەڵ ئەوەدا چاوپۆشیکردن و ڕێزدانان بەرامبەر بە یەکتری لەو شتانەی کە تێیاندا جیاوازین و بۆچونی جیاواز هەڵدەگرن

**٥١- الْجَمْعُ بَيْنَ الْقَدِيمِ وَالْجَدِيدِ وَعَدَمُ الإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ فِي التَّمَسُّكِ بِهِمَا وَالاهْتِمَامُ بِهِمَا**

کۆکردنەوەی کۆن و تازە بەیەکەوە و زیادەڕەوی و کەمڕەوی نەکردن لە دەستپێوەگرتن و گرینگی پێدانیان

**٥٢- عَدَمُ إِلْزَامِ النَّاسِ بِشَخْصٍ أَوْ مَذْهَبٍ أَوْ رَأْيٍ أَوْ فِكْرٍ أَوْ حِزْبٍ أَوْ**

جَمَاعَةٍ (عَلَى الْإِطْلَاقِ)

پەیوەست نەکردنی خەڵکی بە کەسێك یان مەزهەب و ڕێباز و ڕاوبۆچونێك یان فیکر و حیزب و کۆمەڵ و پیرو تاقمێك بە ڕەهایی

٥٣- عَدَمُ الْحُكْمِ عَلَى الْمُقَابِلِ وَالْمُخَالِفِ قَبْلَ الاِسْتِقْرَاءِ وَالتَّيَقُّنِ

حوکم نەدان و بڕیار نەدان لەسەر هیچ کەسێک هەتاوەکو بەدواداچونێکی تەواو و ورد و قوڵی بۆ دەکرێت

٥٤- عَدَمُ انْتِهَاكِ حُرُمَاتِ الْآخَرِينَ

نەشکاندنی شکۆ و سنووری ئەوانی تر

٥٥- عَدَمُ تَنْقِيصِ الْآخَرِينَ وَ تَأْثِيمِهِم

کەمنەکردنەوەی ئەوانی تر و تاوانبارنەکردنیان

٥٦- اِحْتِرَامُ الْعُلَمَاءِ وَأَقْوَالِهِمْ بَدَلَ تَقْدِيسِهِمْ أَوَ تَبْخِيسِهِمْ

ڕێزگرتن لە زانایان و ڕاو بۆچونەکانیان لەبری بە سووک سەیرکردنیان یان پیرۆزکردنیان

٥٧- الصَّدَاقَةُ وَالْمَحَبَّةُ وَالوِئَامُ وَالاِتِّحَادُ

هاوڕێیەتی و خۆشەویستی و ئاشتی و ئاشتەوایی و یەکگرتوویی

٥٨- الْإِنْصَافُ وَالتَّسَامُحُ بَدَلَ التَّعَصُّبِ

ئینساف و لێبوردەیی لەبری دەماگیری

٥٩- التَّعَامُلُ مَعَ الْقَوْلِ بَدَلَ الْقَائِلِ

مامەڵەکردن لەگەڵ قسە و وتە نەوەک قسەکەر

٦٠- التَّعَمُّقُ وَالدِّقَّةُ فِي فَهْمِ الْإِسْلَامِ بَدَلَ السَّطْحِيَّةِ وَالظَّاهِرِيَّةِ

قوڵی و وردبینی لە تێگەیشتنی ئیسلام لەبری ڕووکەشی بوون و زاهیری بوون

٦١- الْاِبْتِعَادُ عَنِ الْعَدَاوَةِ وَالْخِصَامِ وَالتَّفَرُّقِ

دووربوون لە دوژمنایەتی و دووبەرەکی و کێشمەکێش و پەرتەوازەیی

٦٢- الْاِنْتِمَاءُ لِلْمَنَاهِجِ بَدَلَ الْأَشْخَاصِ

ئینتیمابوون بۆ مەنهەج و بەرنامە لەبری ئینتیمابوون بۆ شەخس

٦٣- التَّرْكِيزُ عَلَى الْمُتَّفَقِ عَلَيْهِ

تیشك خستنەسەر ئەو بابەتانەی (شتانەی) کۆدەنگییان لەسەرە

٦٤- الْاِبْتِعَادُ عَنِ التَّكْفِيرِ

دووركەوتنەوە لە بەکافردانان و کافرکردن و تەکفیرکردنی خەڵك

٦٥- تَوْقِيرُ الْعُلَمَاءِ بَدَلَ تَحْقِيرِهِمْ

ڕێزگرتن لە زانایان لەبری سوکایەتی پێکردنیان[1]

---

(١) پەرتووکی (هەستانەوەی ئوممەت) لە نووسینی خۆم: صلاح الدين أحمد.

## هاوەڵانی پێغەمبەر (رضي الله عنهم)

فەزڵ و گەورەیی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر زۆرە، ئەمەش چەند بەڵگەیەک لەسەر فەزڵ و گەورەییەکان:

١. خوای گەورە لە دەیان شوێن لە قورئاندا مەدح و ستایشی کردوون، بۆنموونە: (لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ). الفتح (١٨)

واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی خوا ڕازیی بووە لەو باوەڕدارانەی کاتێک پەیمانیان لەگەڵدا بەستیت (ئەی پێغەمبەری خودا) لەژێر درەختەکەدا.

لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: (وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ) التوبة ( ١٠٠ )

واتە: خوای میهرەبان لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا لە کاروانی کۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون کە چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ

نەمریدا بۆ هەمیشەیش تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرئەنجامە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە.

**٢.** پێغەمبەر (ﷺ) لە چەندان شوێندا باسی فەزڵ و گەورەیی هاوەڵانی دەکات و ئاگاداری دەدات لە ئەزیەتدان و جنێودان پێیان و ....

**(لا تَسُبُّوا أصْحابي، لا تَسُبُّوا أصْحابي، فَوالذي نَفْسي بيَدِه لو أنَّ أحَدَكُمْ أنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا، ما أدْرَكَ مُدَّ أحَدِهِمْ، ولا نَصِيفَهُ)[١].**

واتە: جنێو بە هاوەڵان مەدەن، جنێو بە هاوەڵان مەدەن، سوێند بە کەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر یەکێ لە ئێوە بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێ، ناگاتە مستی یەکێکیان و نیو مستیش.

کەواتە بۆمان دەرکەوت هاوڵان هەم لەلای خوای گەورە و هەم لەلای پێغەمبەر (د. خ) پلە و پێگەیەکی زۆر گەورەیان هەیە.

**٣.** هاوەڵان پاڵپشتی هەرە گەورە و سەرەکی بوون بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئیسلام و ئیمان، بەبێ سڵ کردن بەردەوام لە پشتی پێغەمبەرەوە وەستاون و بەرگرییان لێ کردووە، ئەم پاڵپشیەش هەم بە ڕووح و هەم بە ماڵ و هەم بە خوێن و .... بووە.

---

(١) رواه مسلم (٢٥٤٠) وابن ماجة (١٦١) والطبراني في الأوسط (٦٨٧).

**٤.** ئێمە بە هۆی هاوەڵانەوە ئیسلامان پێگەیشتووە و ئەوان بە ئێمەیان گەیاندووە، هەر لە قورئانەوە تا دەگاتە فەرموودەکان.

## هەڵوێستی دروست بەرامبەر هاوەڵان

**١.** هاوەڵان مرۆڤن و نابێ لە پلەی مرۆڤ ببرێنە سەرتر.

**٢.** هاوەڵان مەعسوم و پارێزراو نیین لە گوناە، بۆیە زۆر ئاساییە ئەوانیش وەک هەر مرۆڤێکی دیکە تووشی هەڵە و کەموکوڕی ببن و تووشیشی بوون.

**٣.** هاوەڵان هەموویان لە یەک ئاستی مەعریفی و ئیمانیدا نیین، هەربۆیە هەیانە پلە و پێگەکەی بەرزترە لە یەکێکی دیکە، وەک هەموو مرۆڤەکانی دیکە.

**٤.** هاوەڵانیش وەک زانایان ئیجتیهادیان کردووە، دەکرێ لە هەندێ شتدا پێکابیان و لە هەندێ شتیشدا نەیان پێکابێت.

**٥.** ڕاجیایی و ئیختیلاف لە ناو زانایاندا هەبووە و شتێکی زۆر ئاساییش بووە.

**٦.** بێڕێزی کردن بە هاوەڵان ئەوپەڕی بێ ئەدەبیە، ئاساییە وەک مرۆڤێک ڕەخنەیان لێ بگیردرێ لە بابەتێک لە بابەتەکان، بەڵام دەبێ ڕێزیان پارێزراوبێت، وەک هەر مرۆڤێکی دیکە.

**٧.** جێبەجێکردنی ئەو یاسایەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز

دەربارەی ئەو جەنگ و شەڕانەی لەنێوان هاوەڵاندا ڕوویداوە: (تلك دماء طهر الله منها أيدينا فلا نلوث بها ألستنا) واتە: «ئەمە خوێنێکە خوای گەورە دەستی ئێمەی تێدا پاراستووە، بۆیە زمانی خۆمان پێ پیس ناکەین». بەڕاستی یاسایەکی جوانە، چونکەم ئەم جەنگ و شەڕانە کە ڕوویداوە بەشی هەرە زۆریان دەستی دەرەکی و ناحەزانی تێدابووە، ئینجا ئەوانیش مرۆڤ بوونە و تووشی هەڵەش بوونە، پێویست ناکات، بە پێوەری ئێستا بێین دادگاییان بکەین، بەبێ ڕەچاوکردنی بارودۆخی ئەو کات و هەلومەرج و کات و سەردەم و شوێن و ژینگە و واقیعەکەیان.

٨. یەکێکی دیکە لە هەڵوێستەکان بەرامبەریان بریتییە لە بەرگری کردن لێیان لە کاتێ ستەملێکرانیان، ئەمە کەمترین وەفایە بەرامبەر ئەو هەموو ماندوو بوون و جیهاد و هەوڵ تێکۆشانەیان بۆ سەرخستنی ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) گەیاندنی بە ئێمە بە ئەمانەت و ڕاستگۆییەوە، ئەم بەرگرییەش بە زۆر جۆر دەکرێت، بۆنموونە ڕەواندنەوەی ئەو تەم و گومانانەی کە دروستکراوە بەرامبەریان، هەروەها ڕاستکردنەوەی ئەو بوختان و ناڕاستیانەی هەڵبەستراون بۆیان، هیچ ڕێگرییەکیش نیە، دوای توێژینەوەی ورد و قوڵ دەست لەسەر هەڵەکان دابنرێت، بەوپەڕی ڕێزەوە، چونکە وەک باسمانکرد ئەوانیش مرۆڤ بوونە و مەعسومیش نەبوونە، بۆیە زۆر ئاساییە هەڵەیان کردبێ و نەیان پێکابێ، لە هەندێ مامەڵە و بۆچوون و ئیجتیهاددا.




## سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئاسان.

٣- تفسير القرآن العظيم ـ ابن كثير.

٤- تفسير جامع البيان عن تأويل آي القرآن ـ الطبري.

٥- تفسير أنوار التنزيل وأسرار التأويل ـ البيضاوي.

٦- تفسير الجلالين ـ جلال الدين السيوطي وجلال الدين المحلي.

٧- تفسير زاد المسير ـ ابن الجوزي.

٨- تفسير مدارك التنزيل وحقائق التأويل ـ النسفي.

٩- تفسير الجامع لأحكام القرآن ـ القرطبي.

١٠- تفسير مفاتيح الغيب ـ الرازي.

١١- تفسير النابلسي ـ النابلسي.

١٢- تفسير المنير ـ وهبة الزحيلي.

١٣- صحيح البخارى

١٤- صحيح مسلم

١٥- سنن النسائی

١٦- سنن أبی داود

١٧- سنن الترمذی

١٨- سنن ابن ماجة

١٩- مسند أحمد

٢٠- سنن الدارمی

٢١- موطأ مالك

٢٢- السنن الكبری للبيهقی

٢٣- سلسلة الأحاديث الضعيفة _ محمد ناصر الدين الألباني.

٢٤- سلسلة الأحاديث الصحيحة _ محمد ناصر الدين الألباني.

٢٥- فتح الباري _ الحافظ ابن حجر العسقلاني.

٢٦- المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج _ النووي.

٢٧- تحفة الأحوذي شرح سنن الترمذي _ المباركفوري.

٢٨- لب العقيدة الإسلامية _ اختصار: صلاح الدين أحمد

٢٩- مختصر مدخل لمعرفة الإسلام _ اختصار: صلاح الدين أحمد

٣٠- الخصائص العامة للإسلام _ يوسف القرضاوی

٣١- العقيدة الاسلامية ومذاهبها _ قحطان الدورى.

٣٢- العقيدة الاسلامية وأسسها - عبد الرحمن حسن حبنكة الميدانى.

٣٣- براهين وجود الله - سامي عامري.

٣٤- براهين النبوة - سامي عامري.

٣٥- شموع النهار – عبد الله بن صالح العجيري.

٣٦- مدخل إلى القرآن الكريم - محمد عبدالله دراز.

٣٧- إثبات نبوة النبي - أبو الحسن اليزيدي.

٣٨- الدين، بحوث ممهد لدراسة تاريخ الأديان _ عبد الله دراز.

٣٩- النبأ العظيم - محمد عبد الله دراز.

٤٠- مدخل إلى القرآن الكريم - محمد عبدالله دراز.

٤١- الأرض _ زغلول النجار.

٢٤- السماء _ زغلول النجار.

٣٤- مبادئ علم الفلك الحديث _ عبد العزيز بكرى أحمد.

٤٤- وجود الله _ يوسف القرضاوى.

٤٥- ئيلحاد وەك خۆی _ صلاح الدين أحمد

٤٦- ياسا گەوهەرييەكان _ صلاح الدين أحمد

٤٧- بوونی باڵا، ٣٠ بەڵگە لەسەر بوونی خودا _ صلاح الدين أحمد

٤٨- ئیسلام وەك خۆی _ صلاح الدين أحمد

٤٩- فەلسەفە لەنێوان ئیسلام و خۆرئاوادا _ صلاح الدين أحمد

٥٠- هەستانەوەی ئوممەت _ صلاح الدين أحمد

٥١- گەنج و ئیلحاد - ئیكرام كەریم.

٥٢- ئیمان و ئیلحاد - علی باپیر.

٥٣- خوداناسی ئایین ئیمان - علی باپیر.

٥٤- پاكانەی هەبوون - موحەممەد صاڵح.

٥٥- پەیامەكانی نوور - سعید نورسی.

٥٦- ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی _ علی باپیر

# بەرهەمەکانی نووسەر

## پەرتووکە چاپکراوەکانی نووسەر:

**١.** ئیلحاد وەک خۆی

**٢.** ئیسلام وەک خۆی

**٣.** یاسا قورئانییەکان

**٤.** هەستانەوەی ئوممەت

**٥.** نەخۆشییەکانی ئوممەت

**٦.** ڕۆڵەی شیرینم

**٧.** یاسا گەوهەرییەکان لە فەرموودەکانی سەروەرمان

**٨.** بوونی باڵا، (٣٠) بەڵگەی عەقڵی، زانستی، لۆژیکی، فەلسەفی، زگماکی، لەسەر بوونی خودا

**٩.** پەڕەی گوڵ، وەڵامی گومانەکان لەسەر پرسەکانی ئافرەتان لە ئیسلامدا

**١٠.** مانای ڕەوان بۆ واژەکانی قورئان

**١١.** فەلسەفە لەنێوان ئیسلام و خۆرئاوادا

١٢. الكافي في المنطق الإسلامي

١٣. الوجيز في شرح المقدمة الآجرومية

١٤. تقريب المعاني في إيضاح وإعراب عوامل الجرجاني

١٥. لب العقيدة الإسلامية في ضوء النقل والعقل

١٦. الكافي في شرح وإعراب عوامل البركوي

١٧. تعلم النحو في خمسين يوما

١٨. مختصر الوجيز في أصول الفقه للدكتور عبد الكريم زيدان

١٩. مختصر قواعد المقاصد للدكتور أحمد الريسوني

٢٠. المختصر الميسر في القواعد الفقهية

٢١. الشرح الجديد على متن البناء في علم الصرف

٢٢. الشرح الجديد على تصريف الزنجانى في علم الصرف

٢٣. الشرح الجديد على قطر الندى

**پەرتووکە چاپنەکراوەکان :**

١. مەوسوعەی ڕۆشنبیری و فیکری ئیسلامی

٢. ڕێبازە فەلسەفی و سیاسی و هزرییە هاوچەرخەکان

٣. زانستی کەلام و گروپە کەلامییەکان

٤. ئیمانناسی، عەقیدەی ئیسلامی لەژێر ڕۆشنایی و عەقڵ و وەحیدا

٥. یاساكانی هاوسەرداری

٦. القياس بين علمي المنطق وأصول الفقه

٧. الإلحاد وجذوره الفلسفية

٨. الخلاصة في علم البلاغة. قسم البيان

٩. مدخل إلى الفكر المقاصدي ومقاصد الشريعة

١٠. الشرح الجديد على متن إيساغوجي في علم المنطق

١١. القواعد الصرفية

١٢. فقه الدعوة إلى الله

١٣. المدخل الى قواعد اللغة العربية (بەهاوبەشی لەگەڵ: د. أحمد محمود).

١٤. الاستحسان وأثره على الفكر المقاصدي

١٥. مختصر النحو الواضح

لەگەڵ چەند پەرتووكێكی دیكە

# ناوەڕۆك